

ژمـاره

٨

# گۆڤاری کۆمپیوتەر

(کانوونی دووەم ) ی ٢٠٠٦

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت ـ وەزارەتی رۆشنبیری دەری دەکات

www.compmagz.com

- چۆنێتی دۆبلاژ کردنی گۆرانی لەبەرنامەی میدیا ستۆدیۆ پرۆ
- لەبەرنامەیەکی ئاساندا کاتەکانی بانگدان لەخەموو جیهاندا بزانە.
- چۆن تەمەنی کۆمپیوتەرەکەت درێژ دەکەیت.




- رۆلی زانکۆی سەلاحەددین لە دابین کردنی کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت بۆ قوتابی زانکۆ.
- چی بکەین ئەگەر پەیوەندیمان بە ئەنتەرنێتەوە پچڕا.



پاشکۆی گۆڤار : سی دی تایبەت بە گۆڤارەکە

هەولێر ـ ٢٠٠٦

# پەیامی سەرنووسەر

## زەرورەتی بوونی یاسای پارێزگاری بۆ بەرهەمەکانی کۆمپیوتەر

لە جیهاندا کاتێك کە کەسێك شتێك بەرهەم دەهێنێت ئەوە ئەو بەرهەمە پارێزراو دەبێت لە ڕووی لەبەرگرتنەوە و بڵاو کردنەوەی نا یاسایی و دەستکاری کردنی ناوەرۆکی بەرهەمەکە. بەلام ئەم کارە لە کوردستان تا ئێستا کۆنترۆڵ نەکراوە بۆ نموونە ئەو کەسانەی کە سیدیەکی تایبەت بە کۆمپیوتەر یان بەرنامەیەکی تایبەتیان دروست کردووە و دەیانەوێت بڵاوی بکەنەوە واتا ئەرکێکی قورسیان کێشاوە بۆ بەرهەم هێنانی ئەو سیدیە یان ئەو بەرنامەیە بەلام کاتێك ئەو بەڕێزەی کە خاوەنی بەرهەمەکەیە دەیەوێت بڵاوی بکاتەوە دەبینێت دوای ماوەیەکی کەم ئەو بەرهەمەی لە هەموو نوسینگەیەك کۆپی کراوە و بڵاو کراوەتەوە بێ ئەوەی خاوەنی بەرهەمەکە ئاگادار کرابێتەوە، ئنجا لێرەدا من دەمەوێت ئەم پەیامە ئاراستەی دەزگا بەرپرسەکان و هەروەها نووسینگەکانی بلاو کردنەوەی بەرهەمی کۆمپیوتەر بکەم کە ئەو کارە نا شایستەیە و ناکرێت مافی ئەو کەسانە بخورێت کە بە بەرهەمێکەوە ماندوو بوونە دەبێت یاسایەکی پارێزگاری هەبێت بۆ ئەو خاوەن بەرهەمانە و هەروەها دەبێت یاسایەکی سزادان هەبێت بۆ ئەو کەسانەی کە سەرپێچی دەکەن و مافی ئەو کەسانە دەخۆن کە بە بەرهەمێکی کۆمپیوتەری یان بەرهەمێکی زانستیەوە ماندوو دەبن چونکە ئەگەر یاسایەك نەبێت ئەوا ئەو کەسانە ناتوانن بەردەوام داهێنان بکەن و بڵاوی بکەنەوە لە ترسی ئەوەی کە خەڵکی تر مافەکانیان دەخوات، لە لایەکی ترەوە دیسان حەقی وایە دەزگایەك هەبێت بۆ چاودێری کردنی ئەو کەسانەی کە کاری تێکدەرانە ئەنجام دەدەن لە بواری پرۆگرامسازیەوە مەبەستم ئەو کەسانەیە کە ( ڤایرۆس ) بڵاو دەکەنەوە و دەبنە هۆی تێك چوون و لە ناو چوونی سیستەم و بەرنامەکانی ناو کۆمپیوتەری هاوڵاتیان و دەزگاکان و کە ئەو کارەش مەترسیەکی گەورەیە لە ڕێگای بڵاو کردنەوەی زانست کە ئێستا کەسانی تێکدەر هەن لە ڕێگای ئەنتەرنێتەوە و بە تایبەتی لە ڕێگای پۆستەکانی ئەلکترۆنیەوە ڤایرۆس ڕەوان دەکەن بۆ کەسانی تر کە بێگومان دەتوانن لە ڕێگای ئەنتەرنێتەوە شێوازی درووست کردنی ڤایرس فێر بن و دواتریش بۆ تێك دانی کۆمپیوتەری خەڵکی تر بەکاری دەهێنن ئنجا تکامان وایە ئەم پەیامە جێگای خۆی بگرێت و هەم دەزگا بەرپرسەکان بیرێکی لێ بکەنەوە و هەم ئەم کەسانەی کە مافی خاوەن بەرهەمەکان دەخۆن و هەروەها ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت کاری تێکدەرانە بکەن با بزانن کە یاسایەك پەیدا دەبێت بۆ سزادانیان.

# گۆڤاری کۆمپیوتەر

ژمارە
8
کانونی دووەم
2006

گۆڤارێکی مانگانەیە تایبەتە بە کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت - وەزارەتی رۆشنبیری دەری دەکات

خاوەنی ئیمتیاز
وەزیری رۆشنبیری
سامی شۆرش

سەرنووسەر
ئاراز مەولود رەشید

ب - نووسین
فاخر مەحمود میرزا

ب - هونەری
یاسین عاصم

دەستەی نووسەران

رێناز ئەردەلان بەکر

شاخەوان عمر حەسەن

کاوە سلیمان

وێنەگری فۆتۆ
هێرش ئسماعیل

هەڵەچن و ووردبین
رێبوار نوری سەعید

پێداچوونەوەی هونەری
ئسحاق خالند حەمەد

**تێبینی : هەموو پەیوەندیەکان لە رێگای سەرنووسەرەوە دەبێت**

### ناونیشان

هەرێمی کوردستانی عێراق / هەولێر . دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری . شەقامی شەست مەتری نزیك هۆڵی زەرد بۆ هەر پێشنیار و تێبینی و سەرنجێك دەربارەی گۆڤارەکە یان ناردنی بابەتێك . پەیوەندی بکەن بەم ناونیشانە : دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری . بەرێوبەرایەتی کۆمپیوتەر . یان بە ژمارە تەلەفۆنی 2527054 مۆبایل 07504618045 یان پۆستی ئەلکترۆنی

Email : aras.co.center@yahoo.com

### تێبینی :

بۆ هەموو ئەو بەرێزانەی کە بابەت ئەنێرن بۆ گۆڤاری کۆمپیوتەر تکایە رەچاوی رێسای نووسین بکەن لەسەر کۆمپیوتەر بە دانانی خالبەندی نووسنی بەم شێوەیەی لای خوارەوە

1- لە پێش فارزە ، هیچ Spase نەبێت لە دوای فارزەش با یەك Spase هەبێت .
2- لە پێش خال . هیچ Spase نەبێت و لە دوای خالیش با دوو Spase هەبێت .
3- ئەو بەرێزانەی کە بابەتی وەرگێران ئەنێرن با ئاماژە بە سەرچاوەکەی بکەن

پەیامنێر
هاوکار رەحمان

دیزاینی بەرگ
عەزیز ئەسعەد

سەرپەرشتیاری چاپ
ئەهرۆ مەحمود











## بەرنامە 3

- دروست کردنی وینەیەکی سروشی بە بەرنامەی photoshop
- چۆنیەتی جیاکردنەوەی دەنگ لەوینەکەی خۆی و کرداری دۆبلاژ لە بەرنامەی (میدیا ستۆدیو).
- زنجیرەی بەرنامەی فلاش Mx
- کۆمپیوتەری هەلگری بەرنامەی فێرکاری بۆ مندالان!!!.
- لەبەرنامەیەکی ئاساندا کاتەکانی بانگدان لەهەموو جیهان بزانە.
- لابردنی ئەو بەرنامانەی لەکاتی کردنەوەی کۆمپیوتەر خۆکاری دەبنەوە.
- زنجیرەی بەرنامەی ئەکسێس.
- بەرنامە pianito studio بۆ ئەوانەی حەز بەژەنینی پیانۆ دەکەن.
- چۆنیەتی پێچەوانە کردنەوەی دەنگێك لەبەرنامەی Cool Edit Pro
- هێنانی بابەتەکانی پرۆژەو ڕێکخستنیان لەبەرنامەی Adobe Premiere
- چۆن بەرنامەیەك لەلیستی دەست پێکردن دادەنێین.
- چۆن بەرنامەی Windows Media Player دادەمەزرێنیت بەبێ بونی سیدی بەرنامەکە.

## زانیاری 28

- کام بەرنامەی دژە ڤایرۆس هەلبژێرم؟
- بۆ ئەوانەی ویندۆزی ئێکس پی بەکار دێنن
- چۆن دەتوانین زووم لەسەر ڕوی شاشە دروست بکەین Magnifier
- چۆن تەمەنی کۆمپیوتەرەکەت درێژ دەکەیت؟
- گەراندنەوەی سیستەمی ویندۆز System Restore
- تەنها لە سالی ٢٠٠٥دا: (١٦ ٠٠٠) ڤایرۆسی کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت.
- ئەو ڤایرۆسەی کەتا ئێستا بەخێراتر و زووتر بلاو دەبێتەوەو زیاد دەکات لەجیهاندا، ڤایرۆسی – Worm my tob. br!
- چۆن چەند کەسێك دەتوانن لەسەریەك ویندۆز xp کاربکەن بەشێوەیەك هەریەکەو بەرنامەی تایبەت بەخۆی هەبێت بەرنامەی هیچان لەلای ئەویتر نەبێتەوە.










## ریپۆرتاژ 39

- رۆلی زانکۆی سەلاحەدین لەدابین کردنی کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت بۆ قوتابیان.

## ئەنتەرنێت 43

- نهێنیەکانی بەرنامەی ئەنتەرنێت ئێکسپلۆرەر.
- کۆمپانیای Google بەرنامەیەکی نوێ دەخاتە بازار
- بەهۆی AOI OpTimized بەئاسانترین شێوە ئیمێل بکە.
- چی بکەین ئەگەر پەیوەندیەکەمان بەئەنتەرنێتەوە پچرا.
- ئینتەرنێت بەبێ کێبل (وایەر).
- چۆنیەتی پەیوەندی کردن و (چات) کردن لە تۆری ناوخۆیی.
- ئاسانترین و خێراترین ڕێگا بۆ خێرایی هەلدانەوەی پەڕەکانی وێب.
- چۆن سود لە Google وەردەگریت؟

## هەمەڕەنگ 56

- هەندێك لەنهێنیەکانی نۆکیای 6600
- جیاوازی لەنێوان Pentium لەگەل Celeron
- داهێنانی شاشەیەکی کۆمپیوتەری نادیار.
- حکومەتی بەریتانیا ئاگاداریەك بۆ بەکارهێنەرانی مۆبایل بلاودەکاتەوە.
- کۆمپانیای نۆکیا وئنتێل هەلدەستن بەدروستکردنی پەردی WiMaX
- ئامێری ups بۆ پاراستنی ئامێری کۆمپیتەر لە پچرانی کارەبا.
- ئنتێل و دروست کردنی دوو پرۆسێسەر r2 Itanium r Intel
- ئامێری تەرازوی ئەلکترۆنی bodymaster
- نۆکیا بابەتێکی ڕەنگی زیوی لە یاری N Gage QD دەردەکات لە ئەوروپاو باکوری ئاوەراست
- (ئنتێل) و Settingی 64 bit

# دروست کردنی وێنەیەکی سروشتی به بەرنامەی Photoshop

بێگومـان بەرنامــەی PHOTOSHOP کە لەلایەن کومپانیای ADOBE ی جیهانی بڵاو دەکرێت و پەرەی پی دەدرێت تاوەکو ئێستا بە یەکێک لە سەرکەوتووترین بەرنامەی تایبەت بە کارکردن لەسەر وێنە دادەنرێت، تاوەکو ئێستا زیاتر لە ٩ فێرژنی تایبەتی ئەو بەرنامەیە لەلایەن کومپانیای ADOBE بەرهەم هاتووە و، هەر فێرژنێکیش بەدەر لەوەی پێشووتری، کومەڵێک گورانکاری بنەرەتی و کاریگەری بەسەر دا دەهێنرێت لەلایەن ئەندازیارانی پەرەپێدەری بەرنامەی PHOTOSHOP .

بنچینەی کارکردن لە بەرنامەی PHOTOSHOP سی شتی سەرەکین:

١ - بەکارهێنانێکی زیرەکانەی ئەو FILTER و PLUG – IN نانەی کە لە نێو بەرنامەکە دا هەن.

٢ - بوونی سەلیقەی تایبەت لە لایەن ئەو کەسەی کار لەم بەرنامەیە دەکات لە بواری تێکەل کردنی رەنگ و وێنەکان .

٣ - خەیال فراوانی ئەو کەسەی کار لە بەرنامەیە دەکات .

کە خالی دوایی، گرنگترین خالی داهێنانە و رێگا خوشکەرە بو ئەوەی بتوانیت پەرە بە تواناکانی خوت بدەیت .

ئەو وانەیەی کە باسم کردووە و بە وێنە هەنگاوەکانم روون کردوتەوە، هیوام وایە ببێتە هەنگاوێک بو چەندین وانەی تری سوودبەخش بو هەوادارانی بەرنامەی PHOTOSHOP و هەوڵ دەدەم نەوەک تەنیا باسی دروست کردنی وێنە و دەستکاری کردنی بکەم، بەڵکو هیوادارم دەرفەتم هەبێت و چونیەتی دیزاین کردنی ماڵپەرێک بە PHOTOSHOP یاخود بەرنامەی ADOBE GOLIVE باس بکەم لەسەر رووپەری ئەم گوڤارە ئازیزە، کە هیوام وایە بەردەوام بێت و گەشە بکات.

تێبینی : ئەم وانەیە تەنها لەسەر هەردوو فێرژنی ADOBE PHOTOSHOP 7.0 ME و 8.0 ADOBE PHOTOSHOP CS دەتوانی ئەنجامی بدەیت.


ئا: گۆران هەریری
goro_8@hotmail.com


**بۆ دروستکردنی ئەم وێنەیە بە بەکارهێنانی بەرنامەی PHOTOSHOP ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بگرە بەر:**

١ - لیستی FILE بکەوە ئینجا NEW هەڵبژێرە دوای هەڵبژاردنی، پێکسلی تایبەت بە پانی لاپەرەکە 500 PIXEL و بە هەمان شێوە بو بەرزی 500 PIXEL دابنی وە بو RESOLUTION یش 72 PIXEL / INCH هەڵبژێرە.







٢ – دوگمەی B لەسەر کیبورد دابگرە یان بچو کلیک لەسەر ئایکونی فلچە بکە لە لیستی ئایکونەکانی تایبەت بە



ئامێرەکانی وێنە کردن لە PHOTOSHOP
دوای ئـەوە دوگـمـەی F5 لـە سـەر KEYBOARD دابگرە.
تێبینی : دەبێت پەنجەرەی تایبەت بە LAYER + BRUSHES هەردووکیان بوونیان هەبێت لەسەر رووکەشی بەرنامەی PHOTOSHOP.
بۆ هێنانی پەنجەرەی تایبەت بە LAYER ئەوا دەتوانین بچین بۆ WINDOWS لە شریتی فەرمانەکان لە ریزی FILE .
٣ – دوای ئەوەی بە داگرتنی دوگمەی F5 پـەنـجـەرەی تـایـبـەت بـە خـاسـیـەت و گۆرانکارییەکانی BRUSHES کرایەوە، دەچین جۆری فلچەی 134 هەڵدەبژێرین کە تایبەتە بە وێنەکیشانی گیا .
٤ – LAYER یکی نوی دروست دەکەین، بە سێ ریگا دەتوانین LAYER ی نوی دروست بکەین :
ریگای یەکەم : بە کلیک کردن لەسەر ئایکۆنی تایبەت بە دروستکردنی LAYER لە پەنجەرەی تایبەت بە LAYERS .
ریگای دووەم : چوون بۆ سەر فەرمانی LAYER لە ریزە فەرمانی FILE و، چوون بۆ سەر فەرمانی NEW و هەڵبژاردنی NEW LAYER .
ریگای سێیەم : بەداگرتنی هەرسێ دوگمەی : CTRL + SHIFT + N لەسەر کیبۆرد.














٥ – دوای ئەمە دێین بۆ هەڵبژاردنی ڕەنگی گیا، بۆ FOREGROUND : 90E044F دابنێ، بۆ : BACKGROUND 145D0E







٦ – بە هێنانی فڵچە بەسەر LAYER ی دروستکراو دەتوانین وێنەی گیا دروست بکەین بەو ئەندازەیەی کە مەبەستمانە.
(ئاگادار بە کاتێک کە فڵچەکە بەکار








دەهێنیت بۆ وێنەکێشانی گیا دەبێت لەسەر LAYER ی تایبەت بێت نەوەک BACKGROUND).

٧ – دوای ئەمە لە پەنجەرەی تایبەت بە LAYERS کلیک لەسەر BACKGROUND دەکەین.
لەخوارەوەی پەنجەرەکە و لەسەر ئایکۆنی کلیک دەکەین لەو لیستەی کە بۆمان دەردەچێت PATTERN هەڵدەبژێرین وە لە PATTERN دەچین CLOUDS هەڵدەبژێرین دوای ئەوە








٨ – جارێکی تر کلیک لەسەر هەمان ئایکون دەکەین وە ئەم جارە HUE/ SATURATION هەڵدەبژێرین
کلیک لە ناو چوارگۆشەی تایبەتی پێش فەرمانی COLORIZE دەکەین و دوای ئەو ئەم سێ نرخە دابنێ : 216 83- – 50 و کلیک بکە لەسەر OK .













پێوانەی SCALE دەکەین بە ٦٠٤ بۆ پێدانی شێوەی هەور بە BACKGROUND ی کارەکەمان .







# چۆنیەتی جیاکردنەوەی دەنگ لەوێنەکەی خۆی و کرداری دۆبلاژ لە بەرنامەی (میدیا ستۆدیۆ)

ئا: فاخیرمحمود میرزا

بێگومان بەڕێزان لەم بابەتەو لەبابەتەکانی پێشوو و هەروەها لەداهاتووش دا بەپشتیوانی خواو بەپشتیوانی ئێوەی خۆشەویست درێژەی زنجیرەی بەرنامەی (میدیا ستۆدیۆ)ی زۆر بەهێز، یەک بەدوای یەک باس دەکەین لەم بەرگەدا باس لەچۆنیەتی جیاکردنەوەی دەنگ لەوێنەکەی دەکەین واتا تۆ کلیپێکت هەیە یاخود پارچە ڤیدیۆیەکت هەیە دەتەوێ دەنگەکەی خۆی لابەری و گۆرانی یاخود مۆسیقا یان هەردەنگێکی تر لەژێر وێنەکە دابنێیت بێگومان ئەو کارە زۆر پێویست و گرنگە بەتایبەتی بۆئەوانەی کەدەیانەوێ دۆبلاژ ئەنجام بدەن چۆنیەتی کارکردن . سەرەتا بەرنامەکە دەکەینەوە پاشان



وێنەی (١)

پارچە ڤیدیۆکە دێنینە ناو بەرنامەکە ئینجا بەلای ڕاستی ماوس کلیکێکی لەسەر ڤیدیۆکە دەکەیت لیستێک دەبێتەوە بەم شێوەیەی (وێنە ١) ئینجا لەخوارەوەی لیستەکە یەکێک لەنووسراوەکان SPLIT هەیە کلیکی لەسەر دەکەیت ڕاستەو خۆ دەنگەکە لە وێنەکە جیادەبێتەوە ئینجا بەکیبورد بە DELETE دەتوانی دەنگەکە بسڕیتەوە هەروەها ئەگەر بتەوەی گۆرانی بۆ وێنەکە دابنێیت لەسەرەوەی بەرنامەکە لەڕێگای INSERT لەوێوە AUDIO لێبدەیت لیستی هاردەکان دەبێتەوە ئینجا ئەوگۆرانیەی لەهاردەکەت داناوە OPEN ی دەکەیت و دەیهێنیتە جێگای ئەودەنگەی سڕیتەوە بەم شێوەیە ( وێنە ٢).



وێنەی (٢)

# زنجیره‌ی به‌رنامه‌ی فلاش MX

ئا: فه‌یسه‌ڵ مه‌عروف

دوای ئاشنا بوونمان به رووبه‌ری سه‌ره‌كی به‌رنامه‌ی فلاش MX و گرنگترین په‌نجه‌ره‌كانی به‌رنامه‌كه له‌م زنجیره هه‌وڵده‌دەین باسی كاری هه‌ندی له ئامرازه‌كان و چینه‌كان بكه‌ین.

**كاری هه‌ندی له ئامرازه‌كان:**

یه‌كه‌م/ ئامرازی دیاری كردن ARROW: له میانه‌ی ئه‌م ئامرازه ده‌توانین گورانكاری به‌سه‌ر شیوه‌كان دابهینین به‌م شیوه‌یه‌ی خواره‌وه:

١. ئامرازه‌كه له شریتی ئامرازه‌كان كلیك ده‌كه‌ین.

٢. دوای دیاری كردنی ئامرازه‌كه ده‌چینه سه‌ر شیوه‌كه و له‌سه‌ری كلیك ده‌كه‌ین به‌رده‌وام ده‌بین له سه‌ر كلیك كردنه‌كه وشیوه‌كه ده‌جولینین به‌مه‌به‌ستی گورینی شیوه‌كه جا گه‌وره‌كردن بیت یابچوك كردنه‌وه، هه‌روه‌ها ده‌توانین شیوه‌كه بگورین به كه‌م كردنه‌وه و دریژ كردنی هیلی شیوه‌كه . وینه‌ی (١)

دووه‌م / قه‌له‌م ره‌ساس PENCIL : ده‌توانین له ریگای ئه‌م ئامرازه وینه بكیشین به ئاره‌زووی خومان، (٣) جوره هیل هه‌یه (هیلی راست STRAIGHT LINE، هیلی لووس SMOOTH، هیلی ئازاد INK ). وینه‌ی (٢).

سی یه‌م/ قه‌له‌م PEN : ده‌توانین له ریگای ئه‌م ئامرازه‌وه چه‌ند خالیك له سه‌ر شانوی كاركردن چه‌ند خالیكی دیاری كراو دروست بكه‌ین، بو وینه كیشانی چه‌ماوه‌یه‌ك خالیك دروست ده‌كه‌ین و پاشان به هوی ماوس (له‌گه‌ل به‌رده‌وام بوون له‌سه‌ر كلیك كردن) ده‌یجولینین تاوه‌كو هیلكی چه‌ماوه‌مان بو دروست ده‌بیت . وینه‌ی (٣).

چواره‌م/ فرچه BRUSH : بو وینه كیشان به فرچه ده‌بیت له سه‌ره‌تا دا چونیه‌تی ره‌نگ كردنه‌كه هه‌لبژیرین، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی (٥) جوره ره‌نگ كردن هه‌یه:








١. ره‌نگ كردنی ئاسایی PAINT NORMAL

٢. ره‌نگ كردنی پر كردنه‌وه PAINT FILLS

٣. ره‌نگركردنی پشته‌وه PAINT BEHIND

٤. ره‌نگ كردنی دیاری كردن PAINT SELECTION

٥. ره‌نگ كردنی ناوه‌وه PAINT INSIDE

هه‌ر جوریك تایبه‌تمه‌ندی و ئامانجی خوی هه‌یه بو شاره‌زا بوون ده‌توانی به كاریان بهینی . وینه‌ی (٤)

**چینه‌كان** ( LAYER ) **له فلاش** MX :

چینه‌كان زور گرنگن و بنچینه‌ی كار كردن بو ریكخستنی كاره‌كان وه له چه‌ند چوار چیوه‌یه‌ك FRAME پیك هاتوون كه شیوه كیشراوه‌كان له خو ده‌گرن، كاتی گورانكاری له چینیكدا دا ده‌كه‌ین ئه‌م گورانكاریه كار ناكاته سه‌ر ناوه‌روكی چینه‌كانی تر، وه هه‌ر چینیك شریتی كاتی تایبه‌تی خوی هه‌یه. وینه‌ی (٥) .

دروستكردنی چینی نوی: بو دروست كردنی چینیكی نوی له لیستی ئاخنین INSERT فه‌رمانی LAYER كلیك ده‌كه‌ین. وینه‌ی (٦)، یاخود له سه‌ر ناوی چینه‌كه كلیكی راسته ده‌كه‌ین و لیستیكمان بو ده‌رده‌كه‌ویت و INSERT LAYER كلیك ده‌كه‌ین، ده‌بینین چینیكی نوی دروست بووه و ناویكی لی ده‌نیین . وینه‌ی (٧).

**گورینی ناوی چین**: بو گورینی ناوی چینه‌كان ده‌بل كلیك له‌سه‌ر چینه‌كه ده‌كه‌ین ده‌بینین ناوی چینه دیاری ده‌كریت و ناویك بو چینه كه ده‌نووسین و ENTER ده‌كه‌ین . وینه‌ی (٨).

جوره‌كانی چین: چینه‌كان له فلاش MX چه‌ند جوریكن كه بریتین له :

١)چینی ئاسایی NORMAL LAYER






ئەم چینە سوود بەخشە بۆ جیا کردنەوەی بابەتەکان لە یەکتر کاتی وینەی دوو بابەتی تیکهەلکیشراو دەکیشین لە یەک چیندا ئەوا دەبنە یەک وینە، بۆیە وا باشە هەر وینەیەک ئەکیشری یا دەقیک دەنوسری ئەوا لە چینیکی جیا بیت، هەروەها دەتوانین تایبەتمەندی چینەکان ریک بخەین وەیا جوری چینەکە بگورین بو چینی ریبەر یا دەمامک یا فولدەر ئەویش بەکلیک کردنی راستە لەسەر چینەکە و هەلبژاردنی فەرمانی (PROPERTIES)·وینەی (٩).

٢) چینی ریبەری جوولەMOTION GUIDE :

ئەم چینە ریرەوی جوولەی جەستەکان دیاری دەکات لە میانەی ریرەویکی دیاری کراودا جا هیلی راست بیت یاچەماوە.

وینەی (١٠)، بو دروستکردنی ریبەری جوولە کلیکی راستە لە سەر چینەکە دەکەین و ADD MOTION GUIDE هەلدەبژیرین. وینەی (١١).

چینی ریبەر LAYER GUIDE لەم چینەدا هەرچی دەنوسری یا وینەی دەکیشری لە کاتی جی بەجی کردندا لە شانوی کاردا هیچ شتیک بە دیار ناکەویت ئەگەر هەردوو دوگمەی ("CTRL+ENTER")لە کیبورد دابگرین. وینەی (١٢). بو دروستکردنیشی کلیکی راستە لە سەر چینەکە دەکەین و GUIDE هەلدەبژیرین . وینەی (١٣) .

٣) چینی دەمامک MASK LAYER :

ئەم جورە چینە سوود بەخشە بو فروفیل و کاری هونەری،























ئەم چینە دەخرێتە ســەر چینێک یا چەند چینێک بۆ شاردنەوە یا دەرخستنی بە شێکی دیاری کراو لە چینەکە . ئەم بەشانە لە چینــی دەمامکراودا بە دیار دەکەون کە کرداری دەمامکیان بۆ ئەنجامدراوە چینی دەمامک دەکەوێتە ســەر چینی دەمامکراو. بۆ دروستکردنیشــی کلیکی راســتە دەکەین لە ســەر چینەکەو فەرمانی MASK هەڵدەبژێرین . وێنەی (١٤).

٤) چینی فۆلدەر:

یەکێکە لە تایبەتمەندیە نوێیەکانی فلاش MX و سوود بەخشە بۆئەوەی چینەکان پۆلین بکەین لە چوار چێوەی فۆلدەر و کار ئاسانیشە بۆ زووتر گەیشتن بە چینەکان.

**چوار چێوەکان** FRAME :

هەروەک پێشــتر باسمان کرد کەوا شــریتی چوار چێوەکان دابەش کراوە بە سەر چوار چێوەکان کە بەشێوەیەکی ستاندەر هــەر (١٢) چــوار چێوە یەک چرکەیە کە لــە میانیدا رێکخەری جوولــەی چــوار چێوە و فلیمــن لە فلاشــدا، دوو جۆرە چوار چێوە هەن :

١) چــوار چێوەی بەتــاڵ EMPTY FRAME: ئەم چوار چێوەیە بەتاڵــە هیچ وێنەیەکــی تێدانیە، کاتێ وێنەیەک دەکێشــین ئەوا دەگۆرێ بۆ چوار چێوەی کلیل.

٢) چوار چێوەی کلیل KEY FRAME: خاڵی گۆرینە لە بارێکەوە

# کۆمپیوتەری هەڵگری بەرنامەی فێرکاری بۆ منداڵان!!!



قوتابخانەکانی شاری (بۆستن) ی ئەمریکا دەستبەکار بوو لە پێدانی قوتابیان بەو جۆرە کۆمپیوتەرە گوێزراوە کە لە بەرهەمی کۆمپانیای (BERNAUT XY_IBM) یارمەتی دانیان و فێرکردنیان لە نێو بەرنامەی (R MOBILE ASSISTANT)کە بە (MA) هێما دەکرێت.

ئەم جۆرە کۆمپیوتەرە هەموو خزمەتگوزاریەک و توانایەکی کۆمپیوتەرێکی ئاسایی هەیە،بۆ ئەوەی قوتابیەکان هەموو وانەکان و راهێنانەکانیان لە رێگای ئەم کۆمپیوتەرە بەجێ بهێنن چ لە پۆل و چ لە دەرەوەی پۆل.

وە کێشی ئەم کۆمپیوتەرە لە کیلۆ گرامێک زیاتر نیە، بۆ ئەوەی هەڵگرتن و گوێزرانەوەی ئاسان بێت، وە لە هەمان کاتیشدا دەتوانرێت لە پشت یان لە ناو جانتای کتابەکان هەڵگیرێت .

وە شاشەی ئەم کۆمپیوتەرە یەک پارچەیە بۆ ئەوەی کارکردنی بەرنامەکانی بە هۆی ئاسان داگرتنیان لە رێگای پەنجە بۆ جێگرتنەوەی لەوحە کلیلە ئاسایەکان (KEY BORD)،وە هەروەها ئەم کۆمپیوتەرە بە پیشاندەری دەنگیش کار دەکات بەهۆی ئەو بلند گویە(SPEAKER) تایبەتیانەی کە بۆ گوێ گرتن لە زانیاریەکان لە کاتی بەجێهێنانی راهێنانەکان بە گوێرەی جۆری سیستەمی خوێندنەکە.

وە شایەنی باسە ئەم کۆمپیتەرە تەنها پرۆگرام کراوە بۆ سیستەمی خوێندن و وە هەروەها هەموو ئەو کتاب و وانانەی تێدا بەدی دەکرێت کە پێویستن بۆ خوێندن بە گوێرەی جۆری قوناغەکان.




بۆ بارێکی تر، کاتێ دەمانەوێ جەستەیەک بگوازینەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ئەوا ئەم چوار چێوەیە بە کار دەهێنین. وێنەی(١٥)٠



# لەبەرنامەیەکی ئاساندا کاتەکانی بانگدان لەهەموو جیهان بزانە

وینەی (١)

**ئا: شادی جلال**

کومپیوتەر لـە حالی ئیستای دونیادا بوەتـە یەکێـک لـە هـۆکارە هـەرە یارمەتیدەرەکانـی مـرۆڤ و خزمەتیکی بەرچـاو دەکات لـە هەمـوو بوارەکانـی ژیاندا لە زانسـتی پزیشکی و نوشداریدا تا دەگاتە بیناسـازی و زانسـتە رامیاری و کومەلایەتیـەکان و هەمـوو بوارەکانی ژیان بەگشـتی لەم روانگەشەوە ئاینیش وەکو بەشـیک لـە ئیمە بیبـەش نەبووە و توانـراوە بەکومپیوتەریش زور شـتی بەسـود دروسـت بکریـت کەببیتە هوی سـود گەیانـدن و خزمەتکردنـی ئاین و لەریگایـەوە سـود گەیاندن بـە کومەل، لەسـەر ئـەم بنچینەی خزمـەت کردن و وەک یەکیک لەئەرکەکانی ئاینی ئیسـلام کەنویـژە بەرنامەیـەک داهینـراوە کـە دەتوانیـت کاتەکانـی بانگـدان لەهەموو جیهان دەسـت نیشـان بـکات و لەکاتی بانگـدان ئـاگادارت بکاتـەوەو ئاماژەش دەدات تـا کاتی نویژەکە بەسـەر دەچیت رینمایـی قیبلـەش دەکات، ئەمـە جگە لە ئاسـانی کارکـردن تیبدا، لـە وینەی (١) روکاریکـی بەرنامەکـە دەردەکەویـت لەهەمـان کاتدا کاتژمیری مەغریب رەنگ کراوە کە نیشـانەی ئەوەیە کە ئیمە لەناو کاتـی بانگـی مەغریب دایـن، چونکە من لـەم کاتە خەریکی نوسـینی ئـەم بابەتە بووم، لەم بەرنامەیەدا کاتەکانی ئیمساک و خورهەلاتـن و بانگـدان جیاکراوەتەوە لەگـەل بونـی کاتژمیریـک بو بـەراورد



کردنی، بۆ زانینی کاتی بانگ دان لە هەر ولاتێکی تر بەم شێوەیە دەیدۆزینەوە: بۆ نمونە ئەمانەوێ کاتی بانگ دان لە پایتەخت بدۆزینەوە لەدوای کردنەوەی بەرنامەکە کە راستەوخۆ دەکەوێتە بەشی چەپی شاشەکە نزیک بە کاتژمێر یان سەر روکاری شاشەکە یان لە لیستی بەرنامەکان بۆی دەچین یەکسەر وەکو لەوێنەی (١) دیارە ئەم روکارە دەردەکەوێت بۆ گۆڕینی کاتە کە چونکە لەسەرەتادا لەسەر سعودیە میقات کراوە یان هەردەتەوێت بیگۆڕیت لیستی (OPTIONS) بکەوەو یەک کلیک لەسەر (PRAYER SETTINGS) بکە وەک لە وێنەی (٢) رونکراوەتەوە دوایی دەست نیشان کردن و کلیک کردن لەسەر بۆکسێک دەکرێتەوە (بڕوانە وێنەی ٣) کە ئەم بۆکسە لە دوو بەش پێک هاتووە یەکیان بریتیە لە ناوی ولاتان و ئەوی تریان پارێزگاکانە وەک ئێمە هەولێرمان دەست نیشان کردوە کاتێک عیراقمان هەڵبژارد، ئەمە جگە لەچەندان جێبەجێکاری تری جوانکاری.



وێنەی (٢)

وێنەی (٣)



وێنەی (١)



وێنەی (٢)

# لابردنی ئەو بەرنامانەی لەکاتی کردنەوەی کۆمپیوتەر خۆکاری دەبنەوە

ئا: تابین شاخەوان

کاتێک کۆمپیوتەر دەکەینەوە ئەوا چەند بەرنامەیەک دەکرێنەوەو ئامادەی کارکردن دەبن تیایدا کەزۆرێک لەم بەرنامانەش بۆ ئەم کاتە پێویست نین، یان کاتێک کۆمپیوتەرەکەت ریستارت دەکەیت و کارێک بەپەلە ئەنجام دەدەیت ئەوا کردنەوەی ئەم بەرنامانە دوات دەخەن ئەوەی راستی بێت هەندێک بەرنامە پێویستن لەم کاتەدا بکرێنەوەو کاربکەن وەکو بەرنامەکانی دژە ڤایرۆس یان بەرنامەکانی چاودێری خەتی ئەنتەرنێت و پاراستنی کۆمپیوتەر . بۆ ئەوەی ئەم بەرنامانەی کە بەم کردارە دەبنەوەو کاری کردنەوەی کۆمپیوتەر دوادەخەن لابەرین و نەهێلین کاتی کردنەوەی کۆمپیوتەر بکرێنەوە ئەوا ئەم رێگایەی خوارەوە بەکاردێنین :

لەسەرەتادا لەفەرمانی (RUN) کە لەلیستی دەستپێکردنەوە بۆی دەچین و دەکەینەوەو لەبۆشاییەکەدا دەنوسین (MSCONFIG) دواتر (OK) دەکەین بروانە وێنەی (١) دوای ئەم هەنگاوە بۆکسێک دەکرێتەوە دەچینە سەر بەشی (START UP) کە بەشی شەشەمە لەم بۆکسەدا هەروەک لەوێنەی (٢) رونکراوەتەوە . هێمای ئاماژەی دەست نیشان کردن لەسەر هەربەرنامەیەک لادەبەین کەمەبەستمانە لەکاتی کردنەوەی کۆمپیوتەر نەکرێتەوە، ئەمە بۆکاتێک کە هەندێک بەرنامە پێویست بن بۆ کردنەوە بەلام ئەگەر ویستمان تەواوی بەرنامەکان نەکرێنەوە ئەوا لەبەشی خوارەوە (DISABLE ALL) دادەگرین، وەک لەوێنەوی (٢) ئەم بەشە رونکراوەتەوە . دواتر کۆمپیوتەرت ریستارت دەکەیت و دوبارە دایدەگیرسێنیت دەبینین ئەم بەرنامانە نابنەوە .

# زنجیرەی بەرنامەی ئەکسێس

ئا: ڕێبوار نوری سعید




وێنەی (١)

**فۆرمەکان** (FORMS)

فۆرم بریتیە لەو بەشەی داتابێس کە لەڕێگایەوە داتا ئەنووسرێت و تۆماری نوێ زیاد دەکرێت هەروەها بەکاردێت بۆ بینین و پێداچوونەوەی داتاو هەموارکردنی و کۆگەکردنی گورانکاریەکان.

فۆرمیش ئەبێ ببەسترێتەوە بە سەرچاوەیەکی داتا (خشتە یان کوێری) بۆ هێنان و پیشاندان و زیادکردنی داتای نوێ بۆ ناو داتای خشتەکە. هەر فۆرمێکیش تەنها لە یەک سەرچاوە داتا وەردەگرێ.

**ڕێگاکانی درووستکردنی فۆرم**

سێ ڕێگای سەرەکی هەیە بۆ دروستکردنی فۆرم:

**ڕێگای یەکەم:** دروستکردنی فۆرم بەڕێگای AUTOFORM بەبەکارهێنانی یەک سەرچاوەی داتا (خشتە یان کوێری).

ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بگرە بەر بۆ دروستکردنی فورم بەم ڕێگایە:

١- لە لیستی تەنەکان OBJECTS لە چوارچێوەی داتابێس یەک کلیک لەسەر FORMS بکە.

٢- لە لیستی ئامرازەکانی چوارچێوەی داتابێسەکە یەک کلیک لەسەر دوگمەی NEW بکە، دوای ئەوە خانەیەک دێتە سەر شاشە چەند ڕێگایەک پیشان دەدات بۆ دروستکردنی فورم. بڕوانە وێنەی (١)

٣- لە خانەی سەرەوەی لای ڕاست یەک کلیک لەسەر ڕێگای AUTOFORM: COLUMNAR بکە.

٤- لە ژێرەوەشی لیستی ناوی خشتەکان بکەوەو یەک کلیک لەسەر ناوی ئەو خشتەیەی ئەتەوێت بکە (لێرەدا کلیک لەسەر ناوی خشتەی tblBOOKS بکە).

٥- یەک کلیک لەسەر دوگمەی OK بکە.




وێنەی (٢)



وێنەی (٣)

دوای ئەوە یەکسەر فۆرمێک دەکرێتەوەو دێتە سەر شاشە، شێوازی پیشاندانی داتاکەی لە جۆری COLUMNAR دەبێت (وەک لەم شێوەیەی خوارەوە دیارە). بڕوانە وێنەی (٢)

٦- دوای ئەوە یەک کلیک لەسەر دوگمەی X بۆ داخستنی فۆرمەکە بکە، خانەیەک دێتە سەر شاشە داوای ناونانی فۆرمەکەت لێ دەکات، تۆش فۆرمەکە ناوبنێ frmBOOKSCOLUMNAR ئینجا یەک کلیک لەسەر دوگمەی OK بکە بۆ کۆگەکردنی. بڕوانە وێنەی (٣)

**تێبینی:**

بۆ بەکارهێنانی ڕێگاکانی تری AUTOFORM وەک TABULAR، DATASHEET، PIVOT TABLE، PIVOT CHART هەمان ئەم هەنگاوانەی سەرەوەی ڕێگای یەکەم بگرە بەر بە جیاوازی هەڵبژاردنی ئەو جۆرەی AUTOFROM کە ئەتەوێت. واتە لە جیاتی :AUTOFROM جۆری :COLUMNAR AUTOFORM DATASHEET هەڵبژێرە بۆ دروست کردنی فۆرم لە شێوازی DATASHEET، هەر بەم شێوەیە بۆ شێوازەکانی تریش.

**کردنەوەی فۆرم:**

بۆ کردنەوەی هەر فۆرمێک:

لە چوارچێوەی بنکەی زانیاری و لە ژێر بەشی FORMS دوو کلیکی خێرا لەسەر ناوی فۆرمەکە بکە، یان لە جیاتی ئەوە یەک کلیک لەسەر ناوی فۆرمەکە بکەو دوگمەی ENTER لەسەر کیبۆرد دابگرە.

**ڕێگای دووەم:** دروستکردنی فۆرم بەبەکارهێنانی توانای خۆت بە ڕێگای DESIGN VIEW.

ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بگرە بەر بۆ دروستکردنی فۆرم بەم ڕێگایە:

١- لە لیستی تەنەکان OBJECTS لە چوارچێوەی داتابێس یەک کلیک لەسەر FORMS بکە.

٢- لە لیستی ئامرازەکانی چوارچێوەی داتابێسەکە یەک کلیک لەسەر دوگمەی NEW بکە، دوای ئەوە خانەیەک دێتە سەر شاشە چەند ڕێگایەک پیشان دەدات بۆ دروستکردنی فۆرم.

٣- لە خانەی سەرەوەی لای ڕاست یەک کلیک لەسەر ڕێگای DESIGN VIEW بکە.

٤- لە ژێرەوەشی لیستی ناوی خشتەکان بکەوەو یەک کلیک لەسەر ناوی ئەو خشتەیەی ئەتەوێت بکە ( لێرەدا یەک کلیک لەسەر خشتەی TBLBOOKS بکە).

٥- یەک کلیک لەسەر دوگمەی OK بکە. بڕوانە وێنەی (٤).

دوای ئەوە یەکسەر فۆرمێک دێتە سەر شاشەو لە حاڵەتی دیزاینەو لەسەرەوەشی لیستێک بە ناوی کێڵگەکانی خشتەکەی سەرچاوەی داتا دەکرێتەوە. بڕوانە وێنەی (٥).

لێرەدا دەبێ ئێمە خۆمان تێکست کۆنترۆڵەکان بۆ فۆرمەکە زیاد بکەین ئەویش بەم ڕێگایە:

٦- لە لیستی ناوی کێڵگەکان، ناوی کێڵگەکان یەک یەک ڕائەکێشین و ئەی خەینە سەر فۆرمەکە، بۆ ئەم مەبەستە نیشانەی ماوس بخەرە سەر ناوی کێڵگەی (BOOKID)، پەنجەت لەسەر دوگمەی لای چەپ دابگرەو بەردەوامبە،



وێنەی (٤)




وێنەی (٥)




وێنەی (٦)

ئینجا نیشانەی ماوس بگوازەوە بۆ سەر فۆرمەکە ئینجا پەنجەت لەسەر دوگمەی چەپی ماوس هەڵگرە – ئەم ڕیگایە پێی دەوترێت DRUG AND DROP

یان لەجیاتی ئەوە، ناوی هەموو کێلگەکان هەڵبژێرەو بەیەکەو ڕایان بکێشە بۆ سەر فۆرمەکە.

یەکسەر دوای ئەوە کۆنترۆڵەکانی کێلگەکان بەم شێوەیەی خوارەوە دێنە سەر فۆرمەکە.

بڕوانە وێنەی (٦)

٧- بۆ داخستنی فۆرمەکە یەک کلیک لەسەر دوگمەی X بکە.

٨- دوای ئەوە خانەیەک دێتە سەر شاشە داوای کۆگەکردنی فۆرمەکەت لێ دەکات، بۆ کۆگەکردنی کلیک لەسەر دووگمەی YES بکە. بڕوانە وێنەی (٧).

٩- خانەیەکی تر دێت داوای نووسینی ناوێک دەکات بۆ فۆرمەکە، تۆش ناوێک بۆ فۆرمەکەت بنووسەو (لێرەدا فۆرمەکەت ناوبنێ :(frmBOOKS))، ئینجا یەک کلیک لەسەر دوگمەی OK بکە. بڕوانە وێنەی (٨).




وێنەی (٧)




وێنەی (٨)

# بەرنامەی PianitoStudio بۆ ئەوانەی حەز بەژەنینی پیانۆ دەکەن




وێنەی (١)

ئا: هێرش ئیسماعیل

بەرێزان بێگومان لەدونیای مۆسیقا ئامێری پیانۆ یەکێکە لەوئامێرە بەهێزانەی کەئێمرۆ لەهەموو دونیا پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆی بینیوە جا چ لەرێگای ئاوازی بیانی بێت یاخود ئاوازی شەرقی بێت کارە مۆسیقییەکانی زۆربەی زۆری ئامێرەکانی لەخۆی گرتوە کەبەکارهێنانیشی زۆر ئاسانە گەر حەزبەژەنینی بکەیت بۆماوەیەکی زۆر کورت پەنجەکانت لەگەڵی لێرادێن بەڵام لەبەر زۆر گرانی ئامێرەکە بەداخەوە زۆر لەوکەسانەی کەزۆرحەز دەکەن بەکاری بێنن پێیان ناکرێت بەم شێوەیەش دەبێتە هۆی لەناوچوونی هیوایەتەکان بەڵام کۆمپیوتەر بەراستی بەربەستێکە بۆ ئاسانکاری بۆیە زۆربەی ئەوئامێرانەی کەلەکرین ناهێن لەبەرنامەیەکی زۆر بچوک بەئاسانی دەگاتە دەستمان بۆیە دەبێت گرنکی بەکۆمپیوتەر بدەین و خۆشمان بوێت، بەرێزان بەرنامەی PIANITOSTUDIO یەکێکە لەوبەرنامە بەهێزانەی کەئامێری پیانۆی بەهەموو پێشکەوتنەکانی دێنێتە بەرچاومان دەتوانین بەکیبۆرد ئامێرەکە بژەنین جگە لەمەش دەتوانیت نۆتە دروست بکەین هەروەها دەتوانیت لەکاتی ژەنین دەنگەکە ریکۆردبکەین بۆناو کۆمپیوتەر سەرەتا پاش دابەزاندنی بەرنامەکە

لەسەر کۆمپیوتەر بەرنامەکە دەکەینەوە وەک لەم شێوەیە دیارە (وینە ١) هەروەها لەناوەراستی بەرنامەکە SHOW KEYS نووسراوە ئەگەر بەماوس کلیکی لەسەربکەیت لەسەر هەریەک لەدوگمەکانی پیانۆکە دیاردەبێت کە چ وشەیەک لەکیبۆرد دەبێتە هوی ژەنینی کام دووگمەی پیانو بەم شێوەیە (وینە ٢) هەروەها لەلای چەپ لەژێر دووگمەکان بۆشاییک هەیە ئەگەر کلیکی لەسەر بکەیت لیستێکی پر نووسراو دەبێتەوە هەرکامیان هەڵبژێریت دەنگە دەگۆرێت بۆ ئەو ئامێرەی هەڵت بژاردوە بەم شێوەیە (وینە٣).



وینەی (٢)

وینەی (٣)

# چۆنیەتی پێچەوانەکردنەوەی دەنگێک لەبەرنامەی Cool Edit Pro


ئا: کاوە سلێمان


بەرێزان زنجیرە بەرنامەی COOL EDIT PRO بەردەوام دەبێت و کارەبەهێزەکانی بەردەوام لەجولەدان شتی نوێتر دروست دەکەن دروست کردنی هەرشتێک یاخود گورانــکاری هەردەنگێک لــەو بەرنامەیە بریتیە لەبەهێزی ئەوبەرنامەیە کەتوانای زور بەرزی هەیە لەدونیای دەنگ هەروەها کارە جوانەکانی خۆیمان پێنیشــاندەدات کەچــۆن بەرەنــگاری دەنــگ دەبنەوە و گورانکاری بەسەریان دەهێنن لەم بابەتە باســی چونیەتــی پیچەوانەکردنــەوەی دەنگیــک دەکەین بەرنامەکــە دەکەینەوە ئەودەنگــەی پیویســتمانە دینینــە نــاو بەرنامەکەپاشان ئەوشوینەی کەدەمانەوی پیچەوانــەی بکەینــەوە بەمــاوس دیاری دەکەین ئینجا لەنوســراوەکانی سەرەوە EFFECTS دەکەینەوە لەویوە REVERSE هەلدەبژیریــن راســتەوخو دەنگەکــە پیچەوانە دەبیتەوە.

# هێنانی بابەتەکانی پرۆژە و ڕێکخستنیان لە بەرنامەی Adobe Premiere

ئا: فەیسەڵ




وێنەی (١)




وێنەی (٢)

دوای ئاشنا بوون بە ڕووبەری سەرەکی بەرنامەی ADOBE PREMIERE ولەگەڵ خستنە ڕووی گرنگترین پەنجەرەکانی بەرنامەکە لە زنجیرەی یەکەم، ئێستا دەچینە سەرهەنگاوی یەکەم ئەویش هێنانی بابەتەکانی پرۆژە و ڕێکخستنیانە لە بەرنامەی ADOBE PREMIERE :

١) دەچینە سەر پەنجەرەی PROJECT و لە ڕووبەرە بەتاڵەکەدا کرتەی ڕاستە دەکەین، وە لە لیستە شارەواکەدا کرتە دەکەینە سەر فەرمانی هێنان IMPORT و دواتر فەرمانی فایلەکان هەڵدەبژێرینFILE. (وێنەی ١).

٢) PREMIERE یەکسەر پەنجەرەی نیشاندان IMPORT دەکاتەوە، لە ڕێنمایی کەری بگەڕێ لەم دیسکەی کە بابەتەکانی پرۆژەکەت تیادا داناوە، (٥) فایل لەگەڵ فایلیەکەدا هەن،ئەویش فایلەکانی (BOYS.AVI و CYCLERS.AVIو FASTSLOW.AVI و FINALE.AVI و MUSIC.WAV )ە چوار فایلی یەکەم بریتین لە دیمەنی تەلەفزیونی وەرزشی وەفایلی دوایی بریتیە لە کاریگەریەکی دەنگی، ئەم فایلانە بە شێوەیەکی ستاندەر لە گەڵ بەرنامەکەدا لەناو ڕێنمایی کەردا هەن C:\PROGRAM FILES\ADOBE\PREMIERE \SAMPLE FOLDER بۆ ئەوەی بتوانین ئەم بابەتانە بهێنین. (وێنەی ٢).

٣) PREMIERE کرداری ئاخنین (ادراج) ی (٥) فایلەکە لە پەنجەرەی PROJECT ئەنجام دەدات وە دەتوانی زیاتر لە ڕێگایەک ببینریت (وێنەی ٣).

٤) PREMIERE بواری ئەوەت پێ دەدات کەوا بە شێوەیەکی خێرا بابەتەکان لەناو پەنجەرەی PROJECT ببینین ئەویش فەرمانی THUMBNAIL VIEWER، هەروەها دەتوانی زانیاری CLIP INFORMATION پەیوەست بە فایلی دیاری کراو بە دەست بهێنی. (وێنەی ٤).

٥) دەتوانی بابەتەکان لە بارێکی تەواو ببینی ئەویش بە دووجار کرتە کردنی فایلەکە لە پەنجەرەی PROJECT، بابەتەکە لە پەنجەرەی بینین SOURCE دەکاتەوە، ئەمەش لە هەنگاوەکانی دواتر ئەنجامی دەدەین.

٦) ئێستا بابەتی یەکەم دەئاخنینە (ادراج) هێلی دەستکاری لە پەنجەرەی PROJECT و فایلی (منداڵە بچوکەکە BOYS AVI) دەدوزینەوە، کیرسەری ماوسەکە لە سەر ئایکونی فایلەکە




وێنەی (٣)

بجولێنە تا نیشانەی کێرسەرەکە دەگۆڕێت بۆ شێوەی دەست پاشان لە کرتە کردنی فایلەکە بەردەوام دەبین و فایلەکە رادەکێشین و لە پەنجەرەی TIMELINE لە چینی یەکەم VIDEO 1 دای دەبەزێنین. (وێنەی ٥).

٧) لە پەنجەرەی بینین MONITOR و لە بەشی پەنجەرەی بینینی بەرنامە PROGRAM کرتە لەسەر ئایکونی PLAY دەکەین بۆ بینینی فایلەکە.(وێنەی ٦).

٨) چەندین ریگا هەیە لە بەرنامەی PREMIERE بۆ بینین (PREVIEW)، ئەویش بینینی بەشە جیاوازەکانی بابەتەکانی بە شێوەیەکی دیاری کراو، بە جولاندنی کێرسەری هێلی دەستکاری EDIT LINE لە پەنجەرەی TIMELINE بەردەوام دەبین لە جولاندنی کێرسەری ماوس لە سەر راستەی کات تا شێوەی کێرسەر دەگۆڕێت بۆشێوەی تیشکێکی رەشی بچوک و پاشان کرتە دەکەین و بەردەوام دەبین لە سەر کرتەکردن لە کاتێکدا بە ئاراستەی راستە و چەپە دەیجولێنین، PREMIERE بە شێوەیەکی ئۆتۆ لە پەنجەرەی بینین PROGRAM هەڵدەستی بە نیشاندانی ئەو دیمەنەی کە ئاماژەی پێ کراوە لە هێلی دەستکاری. (وێنەی ٧).

<u>ئاخنین(ادراج) بە دیقەتی زیاتر:</u>

بەمەبەستی زیاتر فێر بوون وئێستا بابەتی دووەم دەئاخنینە هێلی دەستکاری وە بە بە کار هێنانی دیقەتی زیاتر.

١) لە پەنجەرەی PROJECT ئەو فایلەی کەناوی CYCLERS. AVI هەڵدەبژێرینْ و پاشان لە پەنجەرەی بینین SOURCE لە ژێر پەنجەرەی MONITOR دایدەبەزێنین. (وێنەی ٨).

٢) دابەزاندنی بابەتەکە لە پەنجەرەی SOURCE ئەوە دەگەیەنی کەوا هێشتا فایلەکە بە شێوەیەکی تەواو نەخراوەتە ناو بەرنامەی فلیمی یەکە بەلکو هێشتا لە بواری بینینە، وە دەتوانی بەشێکی لێ ببری و دواتر ئەم بەشە بئاخنینە پەنجەرەی دەستکاری.

٣) ئەمجارە هەڵدەستین بە ئاخنینی بابەتەکە لە خاڵێکی دیاری کراوی پەنجەرەی دەستکاری TIMELINE بە بێ کرداری برین.

٤) پێش ئەوەی کرداری ئاخنین ئەنجام بدەین دەچینە سەر هێلی دەستکاریEDIT LINE و دەیگوازینەوە بۆ خاڵێکی شیاو




وێنەی (٤)




وێنەی (٥)



وێنەی (٦)



وێنەی (٧)



وێنەی (٨)




وێنەی (٩)

کە بتوانین کرداری ئاخنین ئەنجام بدەین، لەم نمونەیەدا هەڵدەستین بە گواستنەوەی هێڵی دەستکاری بۆ کۆتایی فایلی یەکەم کە لە هەنگاوی یەکەمدا کرداری ئاخنینیمان بۆ ئەنجام داوە، وە بۆ گواستنەوەی هێڵی دەستکاری بە شێوەیەکی وورد پەنجەرەی بینین PROGRAM بەکار دەهێنین (وێنەی ٨)، کرتە لە سەر ئایکۆنی NEXT EDIT (ژمارە ١ - وێنەی ٨)، لە ئەنجامدا هێڵی دەستکاری دەچێتە شوێنی ڕاستەکەی خۆی (ژمارە ٢ – وێنەی٨)، وە بۆ ئاخنینی بابەتەکە لەم خاڵە کرتە بکە لە سەر ئاخنین (INSERT) لە پەنجەرەی بینین SOURCE (ژمارە ٣- وێنەی ٨).

٥) پاش جێ بەجێ کردنی فەرمانی پێشوو دەبینین کرداری ئاخنینی بابەتەکە تەواو بووە. (وێنەی ١٠).

٦)ئێستا هەر دوو فایلی FASTSLOW .AVI و FINALE AVI یەک لە دوای یەکدا دەئاخنیە پەنجەرەی TIMELINE بە ئارەزووی خۆمان ڕێگایەک هەڵدەبژێرین، بەلام پێویستە دڵنیا بین کەوا سەرجەم فایلەکان لەتەک یەک بن و هیچ کەلێنێکی بەتاڵ نەبێت لە نێوانیان، لەم کاتەدا دەبینین پەنجەرەی TIMELINE کەم وکورتی تێدایە بۆ نیشاندانی دیمەنەکان بە شێوەیەکی باش لە ڕێگای ئامرازی نیشاندانNAVIGATOR وچوار گۆشەی ڕووبەری نیشاندانی ئاوێنەی بۆ ئەو بەشەی دەمانەوێ دەستکاری بکەین ڕادەکێشین وە چاودێری پەنجەرەی TIMELINE دەکەین بۆ بینینی ئەنجامەکەی. (وێنەی ١١).

٧) بەکارهێنانی فەرمانی یارمەتی دەری NAVIGATOR سوود بەخشە، وە ئەگەر حەز دەکەیت بە شێوەیەکی تەواو کرداری بینین ئەنجام بدەین، ڕێگایەکی تر هەیە بۆ بچووک کردنەوەی ڕووبەری نیشاندان بە شێوەیەکی بەردەوام بۆ ئەوەی بتوانی سەرجەم بابەتەکان لە یەکاتدا ببینی،ڕیگاکەش بریتی یە لە کرتە کردنی ئایکۆنی TIME ZOOM LEVEL لە پەنجەرەی TIMELINE بۆ گۆڕینی ڕووبەرە ئاسۆییەکان کە بابەتەکان داگیری کردووە و هەڵبژاردنی یەکەی کاتی پێویستن . بۆ نمونە لە جیاتی ئەوەی هەر خولەکێک بابەتی دەستکاری کراو لە ڕووبەری دیاری کراودا بەکار بهێنی، کاتەکە دەگۆڕین بۆ چوار خولەک بۆ هەر دیمەنێک لە هەمان ڕووبەردا . (وێنەی١٢).

٨) وێنەی (١٣) پەنجەرەی TIMELINE نیشان دەدات کەوا هەر چوار فایلی ئاخنراوی تیادا دیارە.

٩) پێویستە لە قوناغە سەرەکیەکانی کار کردنمان هەلسین بە هەڵگرتنی پرۆژەکەمان، بو هەڵگرتنی پرۆژەکە دەچینە سەرلیستی FILE فەرمانی SAVE کرتە دەکەین، فایلی ستاندەری



وینه‌ی (١٠)



وینه‌ی (١١)



وینه‌ی (١٢)



وینه‌ی (١٣)

ADOBE PREMIERE بریتی یه له PPJ که کورتکراوه‌ی ADOBE PREMIERE PROJECT. (وینه‌ی ١٤).

١٠)ئیستا راسته‌و خۆ هه‌لده‌ستین به ئه‌نجامدانی کرداره‌کانی برین و ده‌ستکاری کردنی جۆراو جۆری بابه‌ته‌کان ودواتر ئاخنینی فایلی ده‌نگی بۆ بابه‌ته‌کان.

١١) ده‌چینه سه‌ر هیلی ده‌ستکاری EDIT LINE باری بینین ده‌گۆرین بۆ بینینی بابه‌تی یه‌که‌م (دیمه‌نی منداله‌که)، بۆ ئه‌نجامدانی کاره‌که‌مان ریگایه‌کی خیرا ده‌گرینه به‌ر، له په‌نجه‌ره‌ی MONITOR وه له به‌شی PROGRAM ئایکونی MARKER کرته ده‌که‌ین له لیسته‌که فه‌رمانی GO TO هه‌لده‌بژیرین و دواتر IN کرته ده‌که‌ین. (وینه‌ی ١٥).



وینه‌ی (١٤)



وێنەی (١٦)



وێنەی (١٥)

١٢) هەر چەندە بابەتەکە درێژ بێت یاژمارەی زۆر بێت سەیر دەکەین بە شێوەیکی ئۆتو هێڵی دەستکاری دەگەڕێتەوە بۆ خاڵی گەڕانەوەی یەکەم ئەمەش دیمەنی یەکەمە لە بەرنامەکە، چونکە ئێمە خاڵی گەڕانەوەمان دیاری نەکردووە، پاش جێ بە جێ کردنی فەرمانی پێشوو تێبینی دەکەین کەوا کێرسەری هێڵی دەستکاری گواستراوەتەوە بۆ سەرەتای دیمەنی یەکەم لە پەنجەرەی TIMELINE. (وێنەی ١٦).

## ئاگاداری

بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە توانای نووسینیان هەیە لە بواری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت ئەگەر توانای نووسینی بابەتیان هەیە لەم بوارەدا دەتوانن بەشداری بکەن لە گۆڤاری کۆمپیوتەر و دەتوانن سەردانمان بکەن یان بابەتەکانیان بنێرن بۆ ئەم ناونیشانە : هەرێمی کوردستانی عێراق / یەکەی کۆمپیوتەر لە دیوانی وەزارەتی ڕۆشنبیری جادەی شەست مەتری نزیک هۆڵی زەرد یان پەیوەندی بکەن بە سەرنووسەرەوە بەم ناونیشانە مەڵبەندی کۆمپیوتەری ئاراس هەولێر بەرامبەر قەڵا باڵەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا نهۆمی دووەم یان بە ژمارە تەلەفۆنی 2232721 مۆبایل 07504618045 یان پۆستی ئەلکترۆنی

EMAIL : COMPUTER_MAGAZINE_2005@YAHOO.COM

EMAIL : ARAS_CO_CENTER@YAHOO.COM

تێبینی :

*هەر بابەتێک بڵاو بکرێتەوە پاداشتی پێ دەدرێت .

* هەر بابەتێک لە شوێنێک یان گۆڤارێکی تری کوردی بڵاوکرابێتەوە ئێمە بڵاوی ناکەینەوە.

* بابەتەکانتان ئەگەر نەشیا بۆ بڵاوکردنەوە ئەوا ناگەڕێتەوە.

*هەر کەسێک بابەت ئەنێری بۆ بڵاو کردنەوە با بابەتەکەی لەسەر فلۆپی دیسک یان فلاش میمۆری بێت و وێنەی روونکەرەوەکان بەجیا لە نێو فولدەرێک دا بێت و بابەتەکەی بە بەرنامەی MICROSOFT WORD بنووسێت.

# چۆن بەرنامەیەک لە لیستی دەست پێکردن دادەنێین

ئا: بەناز عیرفان - سلێمانی

لە زۆر لە ژمارەکانی گۆڤاری کۆمپیوتەر باسی خێرایی کارکردن و خێرایی جێبەجێکردن و ئەنجامدانی کارو کردنەوەی بەرنامەکان بەزوویی و بەکورترین ماوە کراوە بۆ ئەم مەبەستەش لیستی دەست پێکردن نزیکترین شوێنە کە بتوانیت بە خێرایی کلیک بکەیت و بگەیتە ئەم بەرنامەیە، لەم کردارەشدا شتێک خۆی زاڵ دەکات کە بریتیە لە ریزبەندی بەرنامەکان، بەپێی ئارەزو و بەکارهێنانی تاکە کەسەکان بەرنامەکان دەگۆردرێن بۆ نمونە ئەوانەی کاری نوسین دەکەن ئارەزو دەکەن کە ووَرد بخەنە سەر لیستی دەست پێکردن هەیانە بەرنامەی فۆتۆ شۆپ . ئێمە بۆ تێگەیشتن بەرنامەی ووَرد دەخەینە لیستی دەست پێکردن (START)، لەسەرەتادا دەچینە سەر لیستی دەست پێکردن دوایی بۆ لیستی بەرنامەکان لەوێ بەرنامەی ووَرد هەڵدەبژێرین یان ئەوبەرنامەی کە مەبەستمانە ئینجا لەسەر بەرنامەکە کلیکی راست دەکەین و دواتر (PIN TO START MENU) هەڵدەبژێرین بروانە وێنەی (١) دواتر کلیک لە هەر شوێنێکی دیسک توپ دەکەین تاکو لە کردنەوەی لیستی بەرنامەکان دەرچین کاتێک دەبینین بەرنامەکە هاتوتە ناو لیستی دەست پێکردنەوە ئیتر پێویست بە کردنەوەی لیستی بەرنامەکان ناکات بچینە ناوی بۆ کرنەوەی بەرنامەکە بروانە وێنەی (٢) بۆ زانیاری زیاتر هەر کاتێک بەرنامەی گرنگتر یان پێویستر هەبوون ئەوا دەتوانیت بەهەمان کردار ئەم بەرنامەیی لابەریت بەڵام ئەمجارە دەنوسریت (UNPIN TO START MENU) یان راستەوخۆ لەسەر لیستی دەست پێکردن و لەسەر بەرنامەکە کلیکی راست دەکەیت و بەرنامەکە (REMOVE FROM THIS LIST) دەکەین بەرنامەکە لەم شوێنە نامێنیت .



وێنەی (١)




وێنەی (٢)




# چۆن بەرنامەی Windows Media player دادەمەزرێنیت بەبێ بونی سیدی بەرنامەکە

ئا: شەرمن کریم - سلێمانی

گەلێک جار لەکاتی دامەزراندنی ویندۆزی ئێکس پی بەرنامەی WINDOWS MEDIA PLAYER دانابەزێت و ئەم بەرنامەیە دانامەزرێت، لەهەمان کاتدا بەرنامەیەکی گرنگ و پێویستە بۆ ئیش پێکردنی فایلەکانی ڤیدیۆیی و بەگشتی فایلەکانی دەنگ و رەنگ، لەهەمان کاتیشدا لە کاتە پێویست و گرنگەکاندا ئەم بەرنامەیە نەبێت بۆنمونە ئەگەر بەرنامەیەکی راستەوخۆ لە ئەنتەرنێت سەیر بکەیت یان وەکو لەژمارەی پێشو باسی کەناڵەکانی ئاسمانی کراوە لەئەنتەرنێت بۆ سەیرکردن پێویستمان بەم بەرنامەیە دەبێت یان وەکو باسم کرد بۆ گوێگرتن لە گۆرانیەک یان هەر فایلێکی دەنگی بێت، جا لەبەر بونی تایبەتمەندی باک ئەپ بونی پێکهاتەکانی ویندوز لەناو کومپیوتەرەکەت کە لەکاتی دەمەزراندن پاشەکەوت بونە ئێستا دەتوانیت بە هۆی فەرمانی (RUN) ئەم بەرنامەیە بخەیتەوە ناو کومپیوتەرەکەت ئەویش بەنوسینی (\C:\PROGRAM FILES WINDOWS MEDIA PLAYER\SETUP_ (WM.EXE لەناو فەرمانی (RUN) دواتر (OK) دەکەین و یەکسەر کومپیوتەرەکەت دەست دەکات بەدامەزراندن، بەڵام بۆ زانیاریت ئەگەر ئەم بەرنامەیە لەناو کۆمپیوتەرەکەت هەبێت ئەوا جێبەجێی ناکات، ئەگەر بەم رێگایەش سەرکەوتنت بەدەست نەهێنا ئەوا دەتوانیت لەناو فەرمانی (RUN) بنوسین (C:\PROGRAM FILES\WINDOWS MEDIA PLAYER) و پاشان (OK) دەکەین ئینجا دەچینە فۆلدەری تایبەت و کلیک لەسەر فایلی دامەزراندن دەکەین .بەڵام بۆ رونکردنەوە زیاتر مەرج نیە سیستەمی بەرنامەکانی تۆ لەناو دیسکی (C) بێت ئەم دیسکی بەگوێرەی سیستەمی دەگۆرێت.

McAfee SecurityCenter

McAfee securitycenter

updates support help

my security center

virusscan

personal firewall plus

privacy service

spamkiller

my security index

An index color of green is best, while red indicates a potential security risk.

My Security Index

My AntiVirus Index

My AntiHacker Index

My AntiAbuse Index

My AntiSpam Index

windows updates

Windows Updates Enabled

windows firewall detected

Windows Firewall Detected! The Windows Firewall provides only partial firewall protection. McAfee Personal Firewall Plus provides complete firewall protection, monitoring both inbound and outbound connections.

Learn more about a special competitive upgrade offer.

virus advisory

W32/IRCbot.worm! is a medium risk worm for home users. You can be infected simply by going online. Once infected, your computer may restart continuously.

Up-to-date VirusScan users are protected from this threat.

Get anti-virus protection now!

Check for McAfee updates

# کام بەرنامەی دژە ڤایرۆس هەڵبژێرم؟

ئا: نبیل عبدالرزاق

لەم سەردەمەدا خەلکیکی زور کومپیوتەر بەکاردەهینن، زوربەشیان سوود لە هیلی ئەنتەرنیت وەردەگرن، چ لە مالەوە یاخود لە دەرەوە، فراوان بوونی توری ئەنتەرنیت و ئەو خەلکە زورەی کومپیوتەر بەگشتی و ئەنتەرنیت بە تایبەتی بەکاردەهینن، بیگومان ئەمە بویتە هوی سەر هەلدانی گیروگرفتی جوراو جور لەم بوارەدا، لەم گرفتانەش کەوا لە هەموویان بەرچاوترە ڤایروسە، ڤایروس - خوی لە خویدا بەرنامەیە زیاتر بو مەبەستی ئاژاوە و تیکدانی کومپیوتەر بەکاردی، بو مەبەستی دیاری کراو و جوری جیاوازیشی هەیە، بە سەدان هەزار جور ڤایروس هەیە، لادان و چارە سەر کردنی ئەم گرفتەش بە هەموو کەس ناکریت، کومپانیاکان هەلساون بە دانانی بەرنامەی تایبەت بو چارەسەرکردن و لە ناوبردنی ئەم ڤایروسانە، بویە ناویان ناوە (دژە ڤایروس - ANTIVIRUSE).

دژە ڤایروسەکان جوریان هەیە، هەر جوریکیش دەگەریتەوە بو ئەو کومپانیا

یـان ئـه‌و كه‌سـه‌ی به‌رهه‌مـی هێنـاوه، هـه‌ر یه‌كه‌شـیان تایبه‌تمه‌نـدی و هێزی تایبه‌تـی خۆی هه‌یه بۆ پـاک کردنه‌وه‌ی كۆمپیوتـه‌ر، له‌به‌ر ئـه‌وه‌ی ژماره‌ی دژه ڤایرۆسـه‌كان زۆرن بۆیـه هه‌ڵبژاردنیان ئاسـان نیـه، به‌گوێـره‌ی راپۆرتێـک ده‌ربـاره‌ی هه‌ڵبژاردنی چاكترینیان كه‌وا دژه ڤایرۆسـی AVAST ده‌رچـوو له‌به‌ر ئه‌م هۆیانه‌ی خواره‌وه:

١. ده‌توانـی جـۆری پشـكنینی خێـرا یاخود ته‌واو هه‌ڵبژێری.

٢. گه‌ران به‌دوای ڤایرۆس له ناو فایله زیپ كراوه‌كان.

٣. سه‌رچاوه‌كانی ئامێری كۆمپیوته‌ر داگیـر نـاكـات وه‌ک نـۆرتـون و كاسپه‌رسكای.

٤. پێک دێت له ON ACCESS SCANNER كه‌وا هه‌ڵدسـتێ بـه پشـكنینی فایله‌كانی نـاو میمۆری MEMORY بۆ دڵنیابوون له نه‌بوونی ڤایرۆس، ئه‌مه‌ش دابه‌ش ده‌بێت بۆ حه‌وت خاڵ:

ا. NETWORK SHIELD ده‌تپارێـزێ له هێرشـه‌كانی ئه‌نته‌رنێت (به‌لام باشتر نیه له FIREWALL).

ب. SCRIPT BLOCKING لاپـه‌ره‌ی سـورێنه‌ری ئه‌نته‌رنێـت (INTERNET EXPLORER) ده‌پارێزێ له به‌گه‌رخستنی SCRIPT به شێوه‌یه‌كی توماتیكی.

ج. STANDERD SHIELD میمـۆری (زاكیره) ده‌پشـكنێ و ته‌ئكیـد ده‌كات له نه‌بوونی ڤایرۆس.

د. INSTANT MESSAGING چاودێـری به‌رنامه‌كانی گفتووگۆی خێرا ده‌كات.

هـ INTERNET MAIL چاودێـری نامه‌كانی به‌ریدی ئه‌لیكترۆنی ده‌كات.

ن. چاودێـری به‌رنامـه‌ی OUTLOOK ده‌كات، زۆربه‌ی ڤایرۆسـه ترسناكه‌كان له‌وێـوه په‌ره ده‌سـێنن، وه‌ک ڤایرۆسـی میلیسا.

و. P2P SHIELD به‌رنامـه‌ی P2P ده‌پشـكنێت و ئه‌و فایلانه‌ی له‌رێگه ئه‌ودا به‌كاردێن.

ی. WEB SHIELD چاودێریت ده‌كات له‌و لاپه‌رانه‌ی ئه‌نته‌رنێت كه‌وا بێ كه‌لكن.

٥. له سـیفه‌ته باشـه‌كان VRDB، كه‌وا به‌شێوه‌یه‌كی توماتیكی شێوه و قه‌باره‌ی فایلـه‌كان له‌به‌ر ده‌كات، بـۆ ئه‌وه‌ی له له‌ناوچوون بیان پارێزیت كاتێک تووشی ڤایرۆس ده‌بن.

٦. خۆی به‌شـێوه‌یه‌كی توماتیكی نوێ ده‌كاته‌وه له‌رێگه‌ی ئه‌نته‌رنێت، بێ ئه‌وه‌ی كاره‌كانت ئالۆزبكات یان كۆمپیوته‌ر خاو بكاته‌وه.

ئه‌گه‌ر دڵنیا نیت له‌م دژه ڤایرۆسه ئه‌وه جارێک تاقی بكه‌ره‌وه، نۆرتون و كاسبه‌ر سـكای و ئه‌ی ڤی گی لابده، بزانه چاكی ئـه‌م دژه ڤایرۆسـه‌ت زۆر به روونی بۆ ده‌رده‌كه‌وێـت، له‌گه‌ل هیوای سـه‌لامه‌تی بۆ گشت لایه‌ک.

سه‌رچاوه:
HTTP://WWW.ABSBA.ORG



# بۆ ئەوانەی ویندۆزی ئێکس پی بەکار دێنن




وێنەی (١)

**بێستون عمر**

ئەم چەند بەجێهێنانانە بچوکن بەلام سودی زۆریان هەیە بۆ کاری رۆژانە لەکاتی بەکارهێنانی کومپیوتەردا بەتایبەتی ئەوانەی کە ویندۆزی ئێکس پی بەکار دەهێنن واتە یارمەتی دەرو کورتکردنەوەی هەندی کاری ناو کومپیوتەرەکەتە بونمونە:

١- خێرایی کردنی سیستەم

کارکردن بەخێرایی لەسەر کومپیوتەرەکەت ئاسودەگی و ئارامیت پێدەبەخشێت ئەوەندە زوو وەرەست ناکات لەکارکردن لەسەر کومپیوتەر لەهەمان کاتیشدا نەبونی هیچ رێگریەک و وەستان و کارنەکردن . ئینجا بۆ ئەوەی کە بتوانین ئەدای کومپیوتەرەکەت زیاد بکەیت پێویستە ئەم هەنگاوانە پەیرەو بکە :

لەسەرەتادا دەچینە سەر کونترول پەنال دوایی (SYSTEM) هەلدەبژێرین پاشان (ADVANCED) کلیک دەکەین ئینجا هەلبژاردەی یەکەم کە بریتیە لە (SETTING) کلیک دەکەین بروانە وێنەی ژمارە (٢) پاشان وەکو لە وێنەی (٣) دیارە هەلبژاردەی سێیەم هەلدەبژێرین کە بریتیە لە (ADJUST FOR BEST PERFORMANCE) ئینجا لەکوتایی (OK) دەکەین کەمێک چاوەری دەکەین دەبینین لەگەل ئەم گورانە تەواوی روکاری سیستەمەکەت دەگوردرێت .

٢- دلنیا بوون لە سەلامەتی فایلەکانی سیستەم.

زۆرجار سیستەمەکەت بەهۆی لەدەست دانی هەندێک لە فایلەکانی لەجۆری (DLL) دەبێتە هۆی سست بونی سیستەم یان لەناوچونی هەر فایلێکی تر بێت بۆ ئەم مەبەستە ویندۆزی ئێکس پی سیستەمێکی تایبەتی بۆ ئەم کارە هەیە بەناوی (SYSTEM FILE CHECKER) کە کورتکراوەکەی (SFC) بۆ ئەم مەبەست لە (RUN) بنوسە (SFC /SCANNOW) دوایی راستەوخۆ (OK) بکە ئینجا دوای گەران ئەگەر فایلی کەم بون داوای سیدی ویندۆز دەکات ئەگەرنا گەرانەکە کۆتایی پێ دێت .

٣- کوژاندنەوەی کۆمپیوتەر بەیەک هەنگاو.

شۆرت کەت لە XP زۆر خزمەت گوزاری پێ جێبەجێ دەکرێت یەک لەوانە شەت داون کردنی کۆمپیوتەرە بەیەک هەنگاو بۆ ئەم مەبەستە لە سەر روکاری شاشەی کۆمپیوتەرەکەت کلیکی راست



وێنەی (٢)

وێنەی (٣)

بکە ئینجا بچورە سەر (NEW) پاشان (SHORTCUT) هەڵدەبژێریت بروانە وێنەی (٤) پاشان لەناو چوار گۆشەکە دەنوسین (SHUTDOWN -R -T) ٠٠ ئینجا (NEXT) دەکەین پاشان بە ئارەزوی خۆمان ناوێکی لێدەنێین من ناوم ناوە (کوژاندنەوە) ئینجا (OK) دەکەین لێرەوە هەرکاتێک ویستت کۆمپیوتەرەکەت شەت داون بکەیت دوو کلیک لەسەری بکە یەکسەر کۆمپیوتەرەکەت شەت داون دەکات .



وێنەی (٤)

٤- رەتکردنەوەی نامەی هەڵە بۆ مایکرۆسۆفت

گەلێجار کۆمپیتەرەکەت سست دەبێت و لەدواییدا بۆکسێک دێت داوات لێدەکات کە نامەی هەڵەکە بۆ کۆمپانیای مایکرۆسۆفت بنێریت بەمەش زۆرجار چەند بەرنامەیەک لەگەڵ خۆی دادەخات و زۆر جار کاری گرنگت لەدەست دەدات یان کاری دابەزاندنت لەدەست دەدات بۆ ئەم مەبەستە دەتوانین ئەم نامەیە بەهیچ شێوەیەک دیار نەمێنێت لەسەرەتادا دەچینە کۆنترۆل پەناڵ دوایی(SYSTEM) ئینجا (ADVANCED) هەڵدەبژێرین لەوێش (ERROR REPORTING) هەڵدەبژێرین بروانە وێنەی (٥) دوایی کلیک لەسەر (DISABLE ERROR REPORTING) دەکەین و لەکۆتاییدا کلیک لەسەر (OK) دەکەین .



وێنەی (٥)



# چۆن دەتوانین زووم لەسەر روی شاشە دروست بکەین Magnifier

ئا: رەوەند خەیلانی

ئەگەر بمانەوی هەرشتیک کەلەکۆمپیوتەر سەیری دەکەین دووبەقەدەرخۆی یاخود سیبەقەدەرخۆی ببینین ئەمەکردارێکی زۆر ئاسانە دیین لەسەر روی شاشە START لیدەدەین بەماوس لەویوە PROGRAMS لەویوە ACCESSORIES ئینجا ACCESSIBILITY پاشان MAGNIFIER هەلدەبژیریت کلیکیکی لەسەر دەکەیت بەم شیوەیە (وینە ١) دەبینین کە هیلیکی لاکیشە لەسەرەوەی شاشە زیاد دەبیت، کە تۆکلیکت بۆچ شتیک ببەیت لەم هیلە لاکیشەیە دووبەقەدەرخۆی واتا بەگەورەیی دیارە ئەمەش زۆرپیویستە بۆ ئەوانەی نووسینی وورد بەکاردینن یاخود شتی بچووک سەیر دەکەن دەتوانن تەنها کلیکی ماوسەکە ببەن بەسەر شتەکە لەسەرەوە لەناو هیلەکە بەگەورەیی دیار دەبیت هەروەها لیستیکیش لەگەل ئەم هیلە لاکیشەیە دیتە سەر روی شاشە بەناوی MAGNIFIER SETTINS لەناوەراستی لیستەکە لەسەرەوە لەناو بۆشاییەک ژمارە ٢ نووسراوە بەزیادکردنی ئەم ژمارەیە زوومەکە زیاد دەبیت هەروەها بەکەم کردنەوەی ئەم ژمارەیەش زووم کەم دەبیتەوە واتا چەند زیاد کەیت شتەکان گەورەتر دیاردەبن و وەبەکەم کردنی ئەم ژمارەیەش شتەکان بچوک تر دیار دەبن هەروەها چەند شتیکی تر لەناو ئەولیستەهەیە دەتوانی لەکاتی بەکارهینان تاقیان بکەیتەوە وەک رەش نیشاندانی شاشەو چەند شتی تر.




نبیل ع. فتاح

لە پێناو درێژ کردنی تەمەنی کۆمپیوتەرەکەت و دانانی پاشە رۆژێک بۆ ئەوەی رانەوەستێ لە کار کردن، پێویستە رێنمایی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەیت:

١. داپۆشینی کۆمپیوتەر بە داپۆشەری تایبەتی پاش کوژاندنەوەی بۆ ئەوەی لە تۆز و شتی تر بیپارێزی.

٢. دڵنیابوون لە کوژاندنەوەی سویچی کارەبا، چونکە کۆمپیوتەر بۆ ماوەیەک بە داگیرساوی بمێنێتەوە و بەکاری نەهێنی ئەوا خۆی شاشە دەکوژێنێتەوە، بۆیە وا هەست دەکەیت کەوا کۆمپیوتەر کوژاوەتەوە.

٣. دوور خستنەوەی کۆمپیوتەر لە پەنجەرە، بۆ ئەوەی تیشکی کارۆموگناتیسی ئامێرەکان کاری تێ نەکەن.

٤. گلۆپی فلۆرۆسین (شەمعە) بە شێوەیەکی راستەوخۆ و ژمارەیەکی زۆر بەکار مەهێنە لەو شوێنەی کۆمپیوتەری لێیە بۆ نەهێشتنی کارەسلبیەکانی ئەم گلۆپانە لەسەرەتایی داگیرسانیان.

٥. دەبێ کۆمپیوتەر لە ئامێرەکانی دەستکەوتنی ووزە و تیشکی (X) دوور بێت.

٦. دڵنیابوون لە سەلامەتی و رێک و پێکی ئاگر کوژێنەوەکان لە شوێنەکانی نزیک ژووری کۆمپیوتەر.

٧. نەبەستنی گشت ئامێرەکان بەیەک سەرچاوەی کارەبا، ئامێرەکانی پاشکۆی کۆمپیوتەر یەک بە دوای دابگیرسێنە لە دوای کۆمپیوتەر (بەیەکەوە پێ نەکرێن لەگەل کۆمپیوتەر).

٨. بەکارهێنانی ئامێرەکانی جێگیرکردن و پارستنی تەزووی کارەبا (UPS) و (VOLTAGE).

٩. نەبەستنی ئامێری ناو ماڵ راستەوخۆ لەگەل کۆمپیوتەر راستەوخۆ، وەک بەفرگر چونکە زیان بە کۆمپیوتەر دەگەینێ.

١٠. دوور خستنەوەی ئامێری تەلەفۆن لە سورینەری فلۆپی FLOPY DRIVE چونک زەنگ لێدان لە کاتی کۆپی کردن زەرەرمەندە لەبەر دروست بوونی لیشاوی موگناتیسی لە ئامێری تەلەفونەکە.

# گەڕاندنەوەی سیستەمی ویندۆز System Restore

ئا: اسحاق خالند




وێنەی (١)

ئازیزان بێ گومان ویندۆز زۆر هێماو کاری نهێنی تێدایە کەئەنجامی بدەین یەکێک لەو فەرمانانە فەرمانی SYSTEM RESTORE واتاگەڕاندنەوەی ویندۆز، ئەمە لەکاتێک دێت ئەگەر ویندۆزەکەمان توشی تێکچون بێ یاخوود فایلێکان لێ سڕابێتەوە یان بەرنامەیەک و یان زۆر جارکۆمپیوتەرەکە توشی ڤایرۆس دەبێت و هەموو فایلەکانمان فرێدەدات یاخود تێکدەدات بۆیە ئەمە ئاسانترین ڕێگایە بۆ گەڕاندنەوەی ویندۆزەکە.

سەرەتا لە START بۆ PROGRAM دوای ACCESSORIES لەوێشەوە بۆ SYSTEM TOOLS کلیک دەکەین (وێنەی٢).

وێنەی (٣)



وێنەی (٢)

پاشان NEXT دەکەین (وێنە٣).

دوای هێمایەک دەردەچێت ئەویش مێژووی و بەرواری ڕۆژەکانمانە ئەگەر ویندۆزەکە دوومانگ بێت ئەوا مێژووی ئەو دوومانگە بۆ مان دیاری دەکات.

بۆ یە ئێمە کامە ڕۆژمان بوێت ئەوا کلیکی لەسەر دەکەین و لەپاشان NEXT دەکەین (وینە ٤).

دوای چەند خولەکێک داوای ڕیستارتمان لێ دەکات لەپاش ڕیستارتی ویندۆزەکە دەبینین سیستەمەکە دەگەڕێتەوە بۆ هەمان کات و ڕۆژی کەداوامان لێکردبوو .




وێنەی (٤)




## تەنها لەساڵی ٢٠٠٥ دا:

# (١٦٠٠٠) ڤایرۆسی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت

**وشیار اسماعیل**

بەپـێ ی دواییـن راپۆرت کـە باس لە هەرەشەکانی بواری زانیاری ئەلیکترۆنی دەکات لە ساڵی (٢٠٠٥) ئاماژە بەوە دەکات کـە زیاتر لـە (١٦٠٠٠) ڤایرۆس و کرمی زیان پێ گەیەنەر لەم سـاڵدا بلاوبۆتەوە، وە ئـەوەش رادەگەیەنێت کـە چەتەکانی دزینی زانیاری خۆیان دەخزێننە نێو ئەو بـوار و کارانەی کە بەهۆیـەوە دەتوانن قازانجی زیاتریان دەست بکەویت ئەمەش لە ریگەی دزینی فایلە گرنگەکانی بواری بازرگانـی و پـارەی بانکەکانە لە ریگەی ئینتەرنیتـەوە، وە زیـاد بوونی ئەو ریژە زۆرە لە بەرنامە تیکدەرەکانی کومپیوتەر دەگەریتەوە بۆ چالاکـی بەردەوامی ئەو چەتانـە بـە مەبەسـتی دەسـت کەوتنی پارەی زیاتر.

جیگـەی باسـە کومپانیاکانـی بـواری بازرگانـی و دارایـی لـە سـالی ٢٠٠٥ نزیکـەی (٤٠٠) ملیـون دۆلاریان خەرج کـردووە لە پاریزگاری کردن لە زانیاری نیـو کومپیوتەرەکانـی نوسـینگەکانیان چونکە ئەو چەتانە بە شـیوەیەکی سـەر سور هینەر ڤایروسیان خستوتە نیو ئەو کومپیوتەرانە و دەستیان گرتووە بەسەر فایل و وشە نهینیەکانی ئەو کومپانیایانە لـە بانکە جـوراو جورەکانەوە لە ریگەی ناردنـی نامـەی ئەلیکترونـی و پاشـان دەسـتیان گرتـووە بەسـەر ژمیریـارە بانکیـەکان و تەنانـەت بەکارهینـەری ئاسایی کومپیوتەر و ئینتەرنیتیش.

وە ئەوەش تیبینی کراوە کە چەتەکانی دزینی زانیاری هەر جارە و بە شیوازیک کارەکانیان بە ئەنجام دەگەیەنن و زیانیکی زوریـش لـە کومپانیـا و بەکارهینەرانی ئەنتەرنیتیش دەدەن.

سەرچاوە:
البوابة العربیة للأخبار التقنیة.

# ئەو ڤایرۆسەی کە تا ئێستا بە خێراتر و زووتر بڵاو دەبێتەوەو زیاد دەکات لە جیهاندا، ڤایرۆسی Worm_my tob.br!




ئا: سیروان شەماڵ

زانایانی چاودێر لە بواری ئاسایش و پارێزگاری تۆری ڤایرۆسەکان ئاماژەیان بە پەیدابوونی ڤایرۆسێکی نوێ لە جۆری (کرم) وناوی نراوە (WORM_MY TOB.BR) کرد ئەم ڤایرۆسە لە ژێر ناوی تری وەرگیراویشەوە دەناسرێ، وەک:(YAHOO.GEN@MM32) وە هەروەها (.WIN32_ATAK VARIANT!WORM).

ئەم ڤایرۆسە بە ترسناکترین جۆرەکانی ڤایرۆس دادەنرێت، چونکە لە ریگای تۆری ئینتەرنێت و پۆستەی ئەلیکترۆنی زۆر بەخێرایی بڵاو دەبێتەوەو زۆر دەبێت، ئەم ڤایرۆسە بە یەکێک لە ریگاکانی وەرگرتنی (نامە) کە لە ژێر ئەم ناو نیشانانە(ERROR.GOOD DAY.HELLO.MAIL DELIVERY SYSTEM.MAIL TRANSACTION FAILED.SERVER REPORT.STATUS) وە ناوە رۆکیان یەکێک لەو رستانە بێت:(HERE ARE YOUR BANKS DOCUMENTS.MAIL TRANSACTION FAILED.PARTIAL MESSAGE IS AVAILABLE. BIT_THE MESSAGE CAN NOT BE REPRESENTED INv ASLLA.ENCODING AND HAS BEEN SENT AS ABINERY ATTACHMENT UNCODE CHARACTERS AND HAS BEEN SENT AS BINARY ATTACHMENT.THE MESSAGE CONTAINS).

کاتێک کە ئەم نامانە وەردەگیرێت و دەکرێتەوە، ئامێرەکە یان کۆمپیوتەرەکە توشی ئەم ڤایرۆسە دەبێت کە لە MEMORY کۆمپیوتەرە توش بووە کە نیشتەجێ دەبێت وئینجا کار دەکاتە سەر ناردنی کۆپی لە خۆی لە ناوەوە یاخود لە نامەی پۆستە ئەلیکترۆنیەکانەوە، هەروەها ئەم ڤایرۆسە توشی بەشەکانی ئامێرە کە دەبێت و کار دەکاتە سەر سیستەمی کارکردنەکە، کە ئەمەش دەبێتە هۆی پێگەیاندنی زیانێکی زۆر بەم بەشە وەک:(لەکار کەوتنی بەرنامەکان و سرینەوەی بەیانەکان وە فایلەکانی سیستەمەکە).

وە بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم ڤایرۆسە دەبێت دژە بەرنامەی ئەم ڤایرۆسە(UNTIVAIROS) لە ئامێرەکە پرۆگرام بکرێت، بەڵام ئەگەر رێگای بەرنامەی دژە ڤایرۆسەکە (UNTIVAIROS) سەری نەگرت ئەوا دەبێ هەڵسین بە هەڵگرتنی ئەم برنامەیە بەرێگای بەستنەوەی بە(WWW.TRENDMICRO.COM/DAWNOAD/PATTREM.ASP).

وە پێویستە ئەو کەسانەی کە تۆری ئینتەرنێتیان هەیە کۆمپیەتەرەکانیان ئامادە بکەن بۆ ئەوەی لەم ڤایرۆسە رزگار بن!! لە رێی پەیرەو کردنی ریگاکانی لەناو بردنی ئەم ڤایرۆسە.

# چۆن چەند کەسێک دەتوانن لەسەریەک ویندۆز XP کاربکەن بەشێوەیەک هەریەکەو بەرنامەی تایبەت بەخۆی هەبێت واتا بەرنامەی هیچیان لەلای ئەویتر نەبێتەوە




وێنەی (١)


ئا : محمد ضیاءالدین


بێگومان ویندۆز XP یەکێکە لەو سیستەمە بەهێزانەی کەتوانای زۆرشتی هەیە ئەوشتانە لەویندۆزەکانی تر بەسەرکەوتووی ئەنجام نادرێت ئەمەئاشکرایە یەکێک لەوبەهرەجوانانە بریتیە لە جیاکردنەوەی پارچەی روبەری شاشەو ناوەرۆکی ھاردەکان ئەمەش زۆر پێویستە واتا تۆ لەدەزگایەک یاخود لەفەرمانگەیەک یان لەدوکانێک کاردەکەیت کومپیوتەرەکەت تایبەت بەخۆت نیە بەتەنها پاش تەواوبونی تۆ یەکێکی تر دێتە سەر کومپیوتەرەکەی تۆو کاری خۆی لەسەر ئەنجامدەدات و بەرنامەی پێویستی خۆی لەسەر کومپیوتەرەکە دادەبەزێنێت بەمەش دەبێتە هۆی تێکەڵبوونی بەرنامەکانی تۆو ئەو یاخود تێک چوونی سیستەم لەلای ئەو کە کاری بەسەر تۆوە هەیە سیستەمەکەی تۆش کارناکات و تێک دەچێت بۆ ئەمەش جیاکەرەوەی سیستەم زۆرپێویستە دابنرێت سەرەتا ویندۆزەکەت کەدانراوە دەبێت لەسەر نیزامی NTFS دابنرێت لەبەرئەوەی لەسەر نیزامی FAT32 جیاکەرەوە نیە ئینجا دێیتە سەر ھاردەکان ئەو پارچەیەی دەتەوێ بۆخۆت جیای کەیتەوە بەلای راستی ماوسەکە کلیکێکی لەسەر دەکەیت و ئینجا PROPERTIES هەڵدەبژێریت لەوێوە SECURITY کلیک دەکەیت لەوێوە GROUP OR USER NAME دەرکەوتوە بۆ نووسینی ناوی خۆتە هەروەها PERMISSION دەکەیتە FULL CONTROL پاش ئەوکارانە APPLY دەکەیت ئینجا OK دەکەیت بەم شێوەیە (وێنە ١).

# ڕۆڵی زانکۆی سەلاحەدین لەدابین کردنی کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت بۆ قوتابیان

ڕیپۆرتاژ و فۆتۆ:
ڕێناز ئەردەلان بەکر

**گومان لەوەدانیە کە لە سەردەمی چەکی زانیاریدا زۆربەی سیستەمی خوێندن و بەڕێوەچونی پرۆگرامەکانی خوێندنی قوتابیانی زانکۆ لەدنیادا لەسەر سیستەمی کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێتە، بەشێوەیەکی زۆر فراوان کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت بەکار دەهێنن. لەڕێگای ئەنتەرنێتەوە زانیاری بەسود لەنێوان خۆیان دەگوازنەوە، ڕۆژانە و ڕۆژ بەڕۆژ زانستی نویێ لەم تەکنەلۆژیایە بەدەردەخەن و کادیری بەتوانایان لێ دەردەچێ. لێرەدا ئەوەی جێگای پرسیارە ئایا قوتابیانی کۆلێژەکانی کوردستان بەگشتی و زانکۆی سەلاحەدین بەتایبەتی، تاچەند گەیشتوون بەم ئاستە؟ یاخود**



**سەرۆکایەتی زانکۆ تاچەند کارئاسانی کردووە لە دابین کردنی کۆمپیوتەرو تۆری ئەنتەرنێت بۆقوتابیانی زانکۆ؟ ئایا قوتابیان تاچەند سود لەم بەشە دابین کراوە دەبینن؟ بۆزانیاری زیاتر ڕوی پرسیارمان ئاراستەی چەند قوتابی و مامۆستایەک کرد کەبەم شێوەیە بۆچونی خۆیان دەربڕی:**

**سەرەتا بەڕێز مامۆستا خورشید عادل هەمزە بەرپرسی یەکەی کۆمپیوتەر لەکۆلێژی کارگێری و ئابووری بەم شێوەیە ئاماژەی بەووتەکانی کرد :**

سەبارەت بە بابەتی کۆمپیوتەر و ڕۆلی زانکۆتیایدا بۆ پەرە پیدانی زانکو هەولیکی زوری داوە تاوەکو لەزوربەی کولیژەکانی زانکوی سەلاحەدین کومپیوتەر بەگویرەی پیویست دابین بکات. زانکوی ئیمە کەم تەرخەم نیە لەدابین کردنی پیداویستیەکان، ئیمە گەر بیت و بەنمونە سی سال پیش ئیستای زانکو لەگەل ئیستایی زانکو بەراورد بکەین دەبینین زور جیاوازی هەیە پیشتر کومپیوتەرەکان کون بون بەو

ئاستەی ئیستا نەبوون بەلام ئیستا بە هاوکاری سەرۆکایەتی زانکو ژمارەیەکی زۆرلەکۆمپیوتەرمان بۆ دابین کراوە، ئیمە لیرە دوو هۆلی کومپیوتەرمان هەیە هەروەها (داتا شۆمان) هەیە. بەلام ئەوەی جیگای ئاماژە پیدانە کە ئەو مامۆستایانەی وانەی کومپیوتەر دەلینەوە پسپۆر نین لەم بوارە، راستە لەو کولیژانەی کەبەشی کومپیوتەریان هەیە وەک کولیژی ئەندازیاری مامۆستای پسپۆریان لەم بوارە هەیە بەلام لەکولیژی ئیمە مامۆستای پسپۆر ئەم وانەیە نالینەوە، تەنیا هەندیک لەبەرنامەکانی کومپیوتەر دەلینەوە بەتەواوی لەزانستی کومپیوتەر تینەگەیشتونە. ئیمە لەم سەردەمە پیویستمان بە دبلوم و ماجستیر هەیە لەبواری کومپیوتەر یاخود ئەگەر ئیستا توانای ئەوەمان نەبی باخول بکریتەوە ولە خولەکانیش بروانامەی رەسمی بە مامۆستایانی دەرچوو لەخولەکان ببەخشری بۆئەوەی شارەزایی چاک لەم بوارە پەیدا بکەین و تاوەکو مامۆستایان بتوانن بە جوانترین شیوە خزمەت بەتویژی قوتابیان بکەن.

**قوتابی ساکار عەزیز قوتابی لە کۆلێژی کارگێری و ئابووری دەڵێت:**



بەبوچونی من کومپیوتەر هیچ بایەخیکی پی نەدراوە لە زانکوی سەلاحەدین، ئیستا لەم سەردەمەی خیرایی زور پیویستیمان بەکومپیوتەرە. ئیمە لە قوناغی یەکەم هەندیک بنەما سەرەتاییەکانی کومپیوتەر فیربووین بەلام هیچ سودمان لی نەبینیوە چونکە کومپیوتەر ممارەسەی بەردەوامی دەوی تاوەکو بەتەواوی فیربین، لەکولیژی خومان هولی کومپیوتەرمان هەیە بەلام تەنیا بو قوناغی یەکەمە کە ئەویش هەفتەی جاریک چالاکی خویانی پی دەکەن داواکاریم ئەوەیە ئیمە لەدوارۆژ کەدەرچووین هیچ لەکومپیوتەر نازانین کاری کارگیری پیویستی زوری بەکومپیوتەر هەیە بۆیە داوا دەکەین بومان دابین بکری .

**قوتابی شەیما حسامەدین قوتابی لەکۆلێژی کارگێری و ئابوری دەڵێت:**



ئەوەی ئیمە لیرە بینیمان دوو سالە تەنیا خویندنیکی سەرەتایی کومپیوتەر بوو تەنیا بەشیوەیەکی گشتی بزانین کومپیوتەر چونە لەچی پیک دیت بەشیوەیەکی سادە، واتا نەچوینە ناو قولایی کومپیوتەرەوە. ئیمە دەمانەوی لەهەر چوار سالی خویندنی کولیژ بیخوینین سودی لی وەربگرین چونکە ئیستا ئیمە لەسەردەمی خیراییین دەبی کومپیوتەر زور بەباشی بزانین تاوەکو لەداهاتوو خزمەتی گەل و ولاتی خومان بەنویترین زانستی سەردەمیانە بکەین.

**قوتابی صانع نبی اسماعیل قوتابی کۆلێژی کارگێری و ئابوری دەڵێت :**



سەبارەت بە بابەتی کومپیوتەرو ئەنتەرنیت گەنجەکان بەتایبەتی چینی قوتابیان چەندی بەکاری بهینن ئەوا بوخویان باشە. بەلام ئیمە کەسەیر دەکەین لە هۆبەکانی کومپیوتەری کولیژ هەست بەوە دەکەین کەجورە لاوازیەکی پیوە دیارە، جانازانم دەگەریتەوە بو ئاستی چالاکی خودی قوتابی خوی یاخود کەم تەرخەمی لەلایەکی ترەوە دەکری. بەلام پیویستە پەرە بەم بوارە بدری خومانی بو ئامادە بکەین زیاتر لەم زانست وردبینەوە.

**قوتابی هونەر جەلال خۆشناو قۆناغی سێ یەمی زانستی ڕامیاری بەم شێوەیە هاتە دوان :**



من وەک قوتابیەکی زانکو وا دەبینم کەوا زانکوی سەلاحەدین هیچ گرنگیەکی بە کومپیوتەر و ئەنتەرنێت نەداوە وە ئەگەر هەشبێ و گرنگیشی دابێ کەمە. وەک قوتابیانی کولیژ زۆر پێویستیمان بە ئەنتەرنێتە بۆ ئەوەی بابەتی تازەی لێ وەرگرین بەلام بەداخەوە ئیمە ئەوە مان لەبەر دەست دا نیە داوا دەکەین کەوا زانکوی سەلاحەدین چاوێک بەم بوارە بخشێنی و گرنگی بەم بوارە بدات.

**قوتابی شادیە ڕەسوڵ قوتابی زانستە ڕامیاریەکان دەڵێت :**



من لەوەتەی هاتومەتە ئەم زانکویە هیچ بایەخێکم نەبینیوە بەتایبەتی بە بواری کومپیوتەرو ئەنتەرنێت. من تاکو ئێستا قوتابیەکی زانکو بم، نەتوانم سایتێکی ئەنتەرنێتم هەبێ ئەمە شتێکی ڕەوا نیە لیرەدا بەدی دەکری . داواکارم بەزوترین کات ئەم پیویستیانەمان بۆ دابین بکەن بەتایبەتی ئەنتەرنێت کەزۆر پیویستمان پێیەتی.

**قوتابی ئازاد دیوانی قوتابی کۆلێژی یاسا گوتی :**



هیوادارم زانکوی سەلاحەدین کومپیوتەرو ئەنتەرنێت بۆ قوتابیان دابین بکات بوئەوەی گەنجەکان زانیاریان بەشیوەیەکی بەر فراوان و ئاسان بەدەست بکەوی. چونکە ئیستا چەکی گەورە چەکی زانیاریە ئیمەش بەداخەوە زور دواکەوتوین لەبەرامبەر کەسانی بەرامبەر. ئەگەر کوردستان بەراوردبکەین لەگەل شوینەکانی تر بۆ نمونە لوبنان وەربگرین کەمن خۆم سێ ساڵ لە لوبنان ژیانم بەسەر بردوە بەر لەدە ساڵی لوبنان وەکو ئیستای ئەو ئاستەی کومپیوتەرو ئەنتەرنێتی کوردستانە، لەکولیژەکانی ئەوان ئەنتەرنێت بۆقوتابیان بەلاشە لای ئیمە ئەنتەر نێت تەنیا بۆ ماموستایانە. بۆیە داواکارم کومپیوتەر و ئەنتەرنێتمان بۆ دابین بکرێ .

**قوتابی غازی حەمید قوتابی کۆلێژی یاسا دەڵێت :**

سەبارەت بە دابین کردنی کومپیوتەر و ئەنتەرنێت لەسەرجەم کۆلیژەکان من پێم وایە نەک هەر بایەخی پێ نەدراوە، بەلکو تەواو پشت گوێ خراوە هیچ جۆرە رێک خستن و گونجاندن نیە. واقیعی کولیژ ئیستا سیمایەکی بازرگانی





بەخۆوە بینیوە مامۆستاکان زیاتر لایەنی مادیان بەلاوە گرنگە لەگەڵ کەرتی تایبەت کاردەکەن نەک بۆخزمەتی چینی قوتابیان. ئەنتەرنێت لەکۆلێژەکەمان بەناو دابین کراوە بەلام قوتابی سودی لی نابینێت لەم ماوەیە لەگەڵ سوپای کوری گری بەست کراوە لەلایەن زۆرلە کۆمپانیای مەدەنیەکانەوە ئەو ئامێرانە دابین کراوە، بەلام قوتابی سودی لی نابینێ .بۆیە داواکارم لەسەرۆکایەتی زانکۆ و ڕاگری کۆلێژەکان زیاتر پەرە بەم بوارە بدەن زیاتر بێنە ناو چینی قوتابیان لەنزیکەوە گوێ لەداواکاریەکانیان بگرن .

**قوتابی قارەمان عوسمان قوتابی لەکۆلێژی یاسا دەڵێت:**



وەکو زانکۆ بەتایبەتی زانکۆی سەلاحەدین شتێکی وا بەرچاونیە کەبۆ قوتابی کرابێت. بۆ نمونە لێرە ئەنتەرنێت هەیە بەلام قوتابیان بەهیچ جۆرێک سودی لی نابینن، من وەک قوتابیەکی قۆناغی چوارەم پێویستیم بەئەنتەرنێت هەیە بۆ ئامادە کردنی توێژینەوەی دەرچوونم، جیا لەوەش چوار ساڵە قوتابی کۆلێژم تائێستا هۆڵی ئەنتەرنێتم نەبینیوە دەڵێن هەیە, بەلام بۆ ئێمە نیە. پێویست بوو لەهەر کۆلێژێک سەنتەرێکی گەورە ئەنتەرنێت هەبێ لە جیاتی ئەوەی بایەخ بە کافتریا بدرێت پێویست بوو کافتریایەکی گەورەی ئەنتەرنێت دابین کرابایە. بۆیە هیواخوازین لەداهاتودا بۆقوتابیانی دوای ئێمە ئاوڕێک لەم بوارە گرنگە بدرێتەوە.

**قوتابی ڕێناس جانۆ قوتابی زانستە ڕامیاریەکان گووتی :**



سەبارەت بە دابین کردنی کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت لە زانکۆی سەلاحەدین، بەداخەوە تاکو ئێستا هەنگاوی پراکتیکی لەناو زانکۆ بەدی ناکری تەنیا لەقەوارەیەکی تیۆری باس کراوە ئەو هەنگاوانەی کەنراوە لەسەر حسابی شتی تر بوە بۆ نمونە لەکۆلێژی یاساو زانستە ڕامیاریەکان لەسەر حسابی پەرتوکخانە بەتەمابوینە تۆری ئەنتەرنێت بێننە ناو زانکۆ. بەلام تاکو ئێستا وەک قوتابی هیچ سودیکم نەبینیوە شتێکی ئەکتیڤ (چالاک) نەکراوە بۆمان .

**قوتابی هونەر حەسەن ڕەسوڵ قوتابی پەروەردەی وەرزشی دەڵێت :**



کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت شتێکی زۆر پێویستە بۆ زانکۆ دابین بکرێ. من حەزم دەکرد ئەم شتە سەرەتا لە ئامادەییەوە دەست پێ بکات تاکو قوتابی کە هاتە زانکۆ زیاتر سودی لی ببینێ. لێرە ئێمە کۆمپیوتەرێک بە دوو کەس بەکاردەهێنین ئەنتەرنێتمان هەر نیە ئەو قوتابیانەی کە لە ئەنتەرنێت دەزانن خۆیان لە قاوەخانەکانی دەرەوە یاخود لەماڵەوە فێربون لە زانکۆ فێر نەبوون زانکۆ ڕۆڵی نەبوە لە فێر کردنی قوتابیان هیواداریین ئەم بوارە زیاتر پەرەی پێ بدرێ بۆ ئەوەی قوتابیان سودی لی وەرگرن .



# نهێنییەکانی بەرنامەی ئەنتەرنێت ئێکسپلۆرەر

شۆخان تحسین/ سلێمانی




وێنەی (١)

## زنجیرەی یەکەم

هەموومان ئەنتەرنێت بەکاردێنین و لەگەڵیشیا بەرنامەی ئەنتەرنێت ئێکسپلۆوەر بەکاردێنین بۆ هەڵدانەوەی پەڕەکانی وێب ئەم بەرنامەیەش خۆی لەخۆیدا خاوەنی کۆمەڵێک نهێنی و جێبەجێکاریە لە هەمان کاتدا دەتوانرێت چەندان گۆڕانی تێدا دروست بکرێت بەئارەزوی بەکارهێنەری ئەنتەرنێت، لێرەدا هەوڵدەدەین هەندێک لایەنی شاراوەی ئەم بەرنامەیە دەربخەین بۆ ئەوەی بتوانین بەشێوەیەکی زۆر تەندروست بەکاری بێنین .

لەپێشەوەی کارەکاندا ئەو ئایکونانەی لەسەر شریتی ئامرازەکان لە سەرەوە هەن وەکو هیستوری یان بزوینەرەکانی گەران یان جێبەجێکارەکانی برین و کۆپی و لکاندن هتد دەتوانین گۆڕانیان تێدا بکەین لەرێگای لیستی (VIEW) بەهەڵبژاردنی (TOOLBARS) لەوێش (CUSTOMIZE) هەڵدەبژێرین بڕوانە (وێنەی ١) دوایی بۆکسێک دەردەکەوێت دەتوانین بە کلیک کردن لەسەر (ADD) بەشێک زیاد دەکەین یان بە کلیک کردن لەسەر (REMOVE) یەکە یەکە لەم ئایکونانەی جێبەجێکاری لادەچن بۆیە دەتوانین بەویستی خۆمان ئەوانەی سودیان نیەو بەکاریان ناهێنین لایان بەرین یان ئەوانەی سودیان هەیەو زۆر بەکاریان دێنین دایان نێین، ئەویش بە دەست نیشان کردن و پاشان بەلابردن یان بە دانان هەر کاتێکیش بمانەوێ بگەڕێنینەوە باری ئاسایی خۆی کلیک لەسەر (REST) دەکەین . وەک لەوێنەکە رون کراوەتەوە. لەلایەکی ترەوە دەتوانین بە یارمەتی (MOVE UP) یان (MOVE DOWN) شوێنی ئەم ئایکونە دەست نیشان بکەین، یان زۆرجار لەکاتی زۆربونی ئەم ئایکونانە لەم لیستە دەبێتە هۆی بزربون و دیارنەمانیان وە دەرکەوتنیان بەشێوەی لیستێکی لکاو لەبەشی راستی شاشەکەوە و بۆ دەرچون لەم بارەدا ئەوا وەک لەبەشی خوارەوە دیارە ناوی هەموو ئایکونەکان لادەبین بۆ بچوک کردنەوەیان ئەویش بەهەڵبژاردنی (NO TEXT LABELS) وە لە بەشی قەبارەی ئایکونەکان بچوکەکە هەڵدەبژێرین (SMALL ICONS) پاشان لەکۆتایدا (CLOSE) دادەگرین.

بۆ گەورەکردنی دەقەکان بەکورترین رێگە بریتیە لە هەڵبژاردنی لیستی (VIEW) پاشان (TEXT SIZE) بڕوانە (وێنەی ٣) بەئارەزی خۆمان قەبارەیەک هەڵدەبژێرین .

یان ئەگەر ویستمان ماڵپەرێک زۆر بەخێرایی بکەینەوە ئەوا دەچینە سەر (RUN) پاشان لەبۆشایەکە ناونیشانی ماڵپەرەکە دەنوسین و یەکسەر (OK).

Welcome to
AOL 9.0 OPTIMIZED
Get what you want most from being online
In a few moments, you'll be online with
AOL® 9.0 Optimized – Welcome!

# بەهۆی Aol optimized بەئاسانترین شێوە ئیمێڵ بکە

وێنەی (١)




وێنەی (٢)

**ئا: هیوا محمد**

ئەو کەسانەی کەکار لەسەر ئەنتەرنێت دەکەن و رۆژانە ئیمێل وەردەگرن زۆر پێویستیان بەم بەر نامەیە دەبێت چونکە ئەم بەر نامەیە زۆر بەئاسانی ئیمێلەکانتان بۆ دەکات و ئەگەر داتایەکمان هەبێ ئەوا بەئاسانی بۆمان دەگوازێتەوە بەرنامەکەش بەم شێوەیەیە:

سەرەتا دەچینە سەر WRITE کلیک دەکەین و پاشان پەنجەرەیەکمان بۆ دەر دەچێت، (وینە٣)
پاشان ئەم خانانە پردەکەینەوە وەک:
SEND TO ناردن بۆ
COPY TO لەبەرگرتنەوە بۆ



وینەی (٣)

وینەی (٤)

SUBJECT ناونیشانی پەیوەندی، وەک (وینە ٤).

پاشان ئەگەر بمانەوی وینەیەک یاخود فایلیکی دەنگ ورەنگ بنیرین ئەوا دەچینە سەر ATTACH FILE کلیک دەکەین لەوشوینەی کەدەمانەوی وەری بگرین دەیکەینەوە لەپاشان ئەو فایلەی کەدەمانەوێ دیاری دەکەین و دواتر ATTACH ی دەکەین، (وینە ٥).

دواتر دەچینە سەر SEND NOW کلیک دەکەین ئەوا ئیمێلەکە دەچێت بۆ نێردراوەکە.

تێبینی: دەبێت ئەو کەسەی ئەم بەرنامەیە بەکاردێنێت ئەنتەرنێتەکەی کراوە بێت.

دەبێت کەسی دووەم ئەم بەرنامەیەی هەبێت.



وینەی (٥)




وینەی (١)

سازان کامران

زۆرجار لەکاتی بەکارهێنانی ئەنتەرنێت لەپڕ پەیوەندیەکەمان دەپچڕێت بەبێ ئەوەی هیچ هۆکارێک دیاربێت و هیچ پەرەیەکی وێب هەڵنادرێتەوە ئەمەش زۆرێک لەبەکارهێنەرانی هەراسان کردووە بۆ چارەسەری ئەم کردارەش پەنا دەبەنە بەر دوبارە داگیرساندنەوەی کومپیوتەر کەئەمەش کاتێک دەخایەنێت و لەوانەیە چەند زانیاریەکت لەدەست بدات، وەلەهەمان کاتدا کارکردن و کاریشت لەدەست دەدات جا بۆ ئەوەی بەکورترین ڕیگا لەم سەر ئیشە ببینەوە ئەوا بە چەند هەنگاوێکی بچوک دەتوانین کومپیوتەرەکەمان لەم کیشەیە دەرباز بکەین بڕوانەو لەگەڵم بە :

لەسەرەتادا دەچینە سەر فەرمانی (RUN) دونوسین (REGIDIT) دواتر (OK) دەکەین پاشان بۆکسیک دەکرێتەوە دەچینە سەر بەشی (HKEY_LOCAL_MACHINE ) وەک لەوینەی (١) دیارە پاشان چەند کورتکراوەیەکی تر دێن لەناویاندا (SYSTEM) هەڵدەبژێرین و کلیکی لەسەر دەکەین هەروەک لەوینەی (١) دیارە پاشان دەچینە سەر بەشی (CORRECTCONTROLSET) هەڵدەبژێرین هەروەک لەوینەی (١) دیارە پاشان لەناو ئەم بەشەدا (SERVICES) هەڵدەبژێرین و دەچینە ناو بەشەکانی تری ئەم بەشە وەک لەهەمان وینەی پیشو دیارە لەناو (SERVICES) دەچینە سەر (TCPIP) لەویش یەکسەر بۆ بەشی (PARAMETERS) لەم بەشەدا پیک هاتەکانی ناکەینەوە بەڵکو یەکسەر کلیک دەکەین لەسەری بڕوانە وینەی (٢) پاشان لەناو نرخ و تایبەتمەندیەکان و



وینەی (٢)


وینەی (٣)

جیبەجیکاریەکانی ئەم بەشەدا کە لەوینەی (٢) زور رونکراوەتەوە بەدوای زاراوەی (TCP TIMEDWITEDELAY) دەگەرێین و ئەگەر دۆزیمانەوە ئەوا دوای کردنەوەی نرخەکەی دەگۆرین لە ٢٤٠ بۆ ٣٠ ئینجا دواجار (OK) وەک لەوینەی (٣) دیارە بەلام ئەگەر ئەم زاراوەیە نەبوو ئەوا بۆی دروست دەکەین بەم شیوەیە،

لەسەرەتادا لەبەشی سەرەوە کلیک لەسەر (EDIT) دەکەین پاشان (NEW) هەڵدەبژێرین پاشان (DWORD) هەڵدەبژێرین بروانە وینەی ژمارە (٤) ناوی دەنێین (TCP TIMEDWITEDELAY) پاشان نرخەکەی دەکەینە ٣٠ ئنجا (OK) دەکەین لەکۆتاییدا هەموو پەنجەرەکان دادەخەین و کۆتایی بەم کێشەیە دێنین.

وینەی (٤)



# ئینتەرنێت بەبێ کێبل (وایەر)

**ئا: فائزە**

لە سەرەتای ئازاری سالی ٢٠٠٤ گەشتکەران لەسەر فرۆکەکانی کومپانیای ئەلمانی لوفتهانزا لە ماوەی گەشتکردن لەسەر ئۆقیانی ئەتلەسی لەنێوان ئەوروپا و ئەمریکا توانیان کە ئەنتەرنێت بەکاربهێنن.

ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ (تەکنەلۆجیای خالە گەرمەکان) یان تۆری بێ تەلی ناوخۆ/ WLAN/ WIRELESS LOCAL AREA NETWORK)، ئەو تەکنەلۆجیایەش ڕێگەدەدات بە پەیوەندی کردن بەتۆری ئەنتەرنێت لەڕێگای ئیشارەتی رادیو (FREQUENCY/RF RADIO) لە جیاتی پەیوەندیکردن لە ڕێگای کێبل.

خالە گەرمەکان (HOT SPOTS) بریتیە لە لەو جێگایانەی کە دەتوانرێ تەکنەلوجیای بەیەکەوەبەستنی بێ تەل (بەبێ وایەر) ئەنجام بدرێت کە لەهەموو لایەکی دنیادا بلاوبوتەوە، ئەوەش دەبێتە هۆی هێنانەدی ئازادی پەیوەندی کردنی بەردەوام لەگەل تۆری ئەنتەرنێت لە کاتی سەفەر وگەشتکردن لەهەر کاتێک و لەهەر شوێنێک.

وەبەپێی ئەو لێکولینەوە و شیکردنەوە نوێیانە ئەوا لەسالی ٢٠٠٥ ژمارەی خالە گەرمەکان دەگاتە سەدان هەزار لە هەموو لایەکی دنیادا ، ئەو خالە گەرمانە حالی حازر لە هولی

چاوەروانیکردن لە فرۆکەخانەکان و هوتیلەکان و چیشتخانەکان و قاوەخانەکان و هۆلی کۆبونەوەکان و پیشانگاکان دەبینین.
تەکنەلوجیای خالە گەرمەکان HOT SPOTS پشت بەدوو رەگەزی سەرەکی دەبەستێت:
یەکەم: کارتی بێ تەلی کۆمپیوتەر CARD WIRELESS COMPUTER که دەکرێ بەشێک بێت لە کۆمپیوتەر (یان هەر ئامێرێکی تر) یان دەکرێ بخرێتەسەری، ئەو کارتانە شەپۆلی ناوخۆیی و دەرەکی تێدایە.
دووەم: خالی گەیشتن ACCESS POINT : کە تۆرە بێ تەلەکانی ناوخۆ بە تۆری ئەنتەرنێتەوە دەبەستێت.
بەلام لەناو فرۆکەدا پشت بەتەکنولوجیای خالە گەرمەکان دەبەستێ، ئەوا کێشەی خالی گەیشتن بەهۆی ئەنتێنایەک چارەسەردەکرێ لەدەرەوەی فرۆکەکەدایە و پەیوەندی هەیە لەگەل مانگە دەستکردەکان و بەوهۆیەوە گەشتکەرەکان لەسەر فرۆکەکە دەتوانن پەیوەندی بکەن بە تۆرەکانی ناوخۆ لەسەر زەوی.
کەواتە ئەو تەکنەلۆجیایە تەنها پێویستی بە کۆمپیوتەرێک هەیە کە کارتی بێ تەلی تێدایە و شوێنێک کە خالێکی گەرمی تێدایە (خالی گەیشتن لە شوێنێکی گشتی)، ئیتر دەتوانی بەئازادی ئەنتەرنێت بەکاربهێنی.

**خێرایییەکی زیاتر .. تێچوونێکی کەمتر:**

بەبەراوردکردن لەگەل تەکنەلۆجیایەکانی تر ئەوا تەکنەلوجیای تۆرەکانی ناوخۆی بێ تەلی بەبەکارهێنانی ئیشارەتی رادیۆ (WLAN) توانیویەتی کە بەسەر گرفتی گواستنەوەی زانیاری بێ تەلی بۆ ماوە دوورەکان بەسەربکەوێ و بە تێچونێکی گونجاو و کەمتر لە تەکنولوجیایەکانی تر، بۆ نمونە توانی زال بێت بەسەر تەکنەلۆجیای گواستنەوەی زانیاری لەرێگای تیشکی ژێر سوور کە ماوەکەی زۆر کورت بوو و لە ۲۰ مەتری تێپەر نەدەکرد و توانای ئەوەشی نەبوو کە دیوارەکان وبەربەستەکان تێپەربێت، وەهەروەها زال بوو بەسەر تەکنەلۆجیای UMTS)) UNIVERSAL MOBILE TELECOMMUNICATIONS SYSTEM کە لە موبایل بەکاردێت، لەبەر ئەوەی تەکنەلۆجیای ئیشارەتی رادیۆ زۆر خێراترە و تێچونەکەشی کەمترە، هەروەها تەکنەلوجیای UMTS لەبازاردا کەمە و نرخەکەشی گرانە.
خێرایی گواستنەوەی داتاکان لەرێگای خالە گەرمەکانەوە زیاتردەبێت بە زیادبوونی دووری نیوان بەکارهێنەر(گەشتکەر) و خالی سەر ئەرز، ئەو دووریە لە ناوچە کراوەکان دەگاتە ۳۰۰ مەتر و لەناوچە داخراوەکان (بەهۆی دیوارەوە) دەگاتە ۵۰ مەتر، لەهەندێک جاریش پێویستیمان بە چەند خالێکی گەرم هەیە بۆ پەیوەندی کردن لەناوچەیەکی فراوان.

**چەند سیستەمێک بۆ پێوانەکردن:**

پەیمانگەی ئەندازیارە ئەلیکترونیەکان IEEE INSTITUTE OF) ELECTRICAL AND ELECTRONICS ENGINEERS لە ئەمریکا هەلسا بە دانانی مواصەفاتی پێوانەیی بۆ تۆرەکانی بێ تەلی ناوخۆیی، ئەو پەیمانگەیە دەستی بەکارەکانی کرد لە سالی ۱۹۹۷ ئەویش بە دانانی سیستەمی 802.11 کە رێگا دەدات بە گۆرینەوەی زانیاری وداتاکان بە خێرایی ۲ میگابایت لە یەک چرکەدا، ئەو سیستەمە هەندێک گۆرانکاری بەسەردا هات و بوە هۆی پەیدابوونی دوو سیستەمی پێوانەکردنی تر لەسالی ۱۹۹۹، سیستەمی B802.11 کە زانیاریەکان بە خێرایی ۱۱ میگابایت لە یەک چرکە دەگوازێتەوە و سیستەمی A802.11 کە زانیاری وداتاکان بەخێرایی ٥٤ میگابایت لە یەک چرکەدا دەگوازێتەوە.
بەلام زۆربەی ئەو ئامێرانەی کەلە بازاردا هەن بەپێی سیستەمی پێوانەیی B802.11 ئیش دەکەن، ئەوەش لەبەر ئەوەی ئامێرەکانی سادەن و بەئاسانی دەبەسترێن و نرخەکانیان گونجاوە، وە هەروەها ئەو ئامێرانەی کە پەیرەوی سیستەمی پێوانەیی A802.11 دەکەن ناتوانی لەگەل سیستەمی B802.11 کاربکات، ئەوەش بەهۆی جیاوازی شەپۆلەکان لەنێوانیان. لەبەر ئەوە لەناوەراستی سالی ۲۰۰۳ سیستەمێکی نوێ پەیدابوو G802.11 کە لەهەمان شەپۆلی تایبەت بە سیستەمی B802.11 ئیش دەکات، بەلام خێرایی گواستنەوەی زانیاریەکان زیاتر بوو و گەیشتە ٥٤ میگا بایت لەیەک چرکەدا، ئەو سیستەمەش لە تەکنەلۆجیاکانی دوارۆژ بەکاردێت وەکو گۆرینەوەی ناوەرۆکە کارلێکەرەکان و فیدیۆییەکان.
ئەو لایەنەش کە ئاستی ئیش پێکردنی گۆرینەوە تاقی دەکاتەوە لە ئامێرەکانی تۆری بێ تەل ناوخۆیی ئەوە پێی دەوترێ یەکێتی پیشەسازیەکانی ئەمریکا (WECA) ALLIANCE WIRELESS INTERNET COMPATIBILITY واتە یەکێتی گونجانی ئەنتەرنێتی بێ تەل. ئەو ئامێرانەی کەئەو تاقیکردنەوەیە تێدەپەرێنن ئەوا مۆری WIRELESS FIDELITY (WI-FI) یان پێوە دەبێت. بەو شێوەیەش ئەو ئامێرانەی کارتی تۆری بێ تەل هەلدەگرن و لەلایەن چەندین کۆمپانیاوە دروستکراون دەکرێ بەیەکەوە ئیش بکەن و بگونجێن.
بۆ پاراستنی زانیاری وداتاکان لە دژی جاسوسی و دزین ئەوا تۆرەکانی بێ تەل ناوخۆیی بەرنامەی تایبەتی شیفرەدانان بەکاردەهێنن بۆ ناسینەوەی بەکارهێنەران.
حالی حازر لە ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و ئەوروپای رۆژئاوادا زۆرترین خالی گەرم هەیە، بەلام لە وولاتانی عەرەبی ئەوە ژمارەی خالە گەرمەکان روو لەزیادبوونە بەتایبەتی لە ئیمارات و کویت و سعودیە و بەحرەین .
ئەمرۆ لەسەر تۆری ئەنتەرنێت چەندین سایت هەیە کە شوێنی خالە گەرمەکانت پێدەلێت، چاوگێران بەو سایتانە پێش سەفەرکردن یارمەتیت دەدات کە لەکاتی سەفەرکردنتدا بەشێوەیەکی بەردەوام پەیوەندیت بە تۆری ئەنتەرنێتەوە هەبێت و بەئازادی و بەبێ بەکارهێنانی کێبل(وایەر).



# چۆنیەتی پەیوەندی کردن و (چات) کردن لە تۆڕی ناوخۆیی

نووسینی:
ئازاد صالح نادر ڕواندزی



وێنەی (١)

لێرەدا دەمەوێ باسی چۆنیەتی پەیوەندی کردن لە نێوان خەلکانێک لە یەک فەرمانگە یان لە یەک کۆمپانیا کە تیایدا زیاتر لە یەک کۆمپیوتەر هەبێ .... لە نێوان پرسگەو بەڕێوەبەر یان هۆبەیەک و هۆبەیەکی تر ..وە هەروەها جاری وا هەیە بۆ قسە کردن یان جێ بەجێ کردن و ڕاپەراندنی کارەکان بە کار دێ بەبێ بەکار هێنانی هیچ بەرنامەیەک یەکەم جار وەک لە وێنەی ژمارە (١) دیارە.

* دەچینە سەر MY COMPUTER کلیکی لای ڕاست دەکەین.

* ئنجا لە لیستکە MANAGE هەلدەبژێرین.

* پەنجەریەکی نوێت بۆ دەکرێتەوە لەوێ دەچینە سەر ACTION

* لە لیستە کە دەچینە سەر CONNECT TO ANOTHER COMPUTER واتە پەیوەندیم ببەستە بە کومپیوتەرێکی ترەوە.

* پەنجەرەی SELECT COMPUTER دەردەکەوێ بۆ هەلبژاردنی ئەو کومپیوتەرەی کە دەتەوێ پەیوەندی پێوە بکەی وە لە ناو پەنجەرکە لە و ناوانە



وێنەی (٢)





وێنەی (٤)



وێنەی (٣)

دەگەری ی کە ئیستا لەسەر هێڵن بۆ نموونە وەک وێنەی ژمارە ( ٣ )

* بۆ نمونە کۆمپیوتەری AZAD مان دۆزیـەوە وە OK مـان لەسـەری کرد وێنەی ژمارە ( ٤ )

* دەچینەوە سەر ACTION وە ALL TASKS وە لەوێ دەچینە سەر SEND CONSOL MASSAGE (وێنەی ژمارە ٤)

* پەنجەرەی SEND CONSOL MASSAGE دەکرێتەوە لە ژێرەوە نامەکەت بنووسە پاشان کلیک لەسەر SEND بکە وەک لە وێنەی ژمارە ( ٥ )

* دەبینین نامەکەت دەروات وە ک لە وێنەی ( ٦ ) دیارە بەڵام گەر AZAD یان ئەو ناوەی داوات کردبوو لەسەر هێل نەبوو یان نێت وورک نەبوو وە لەوێنەکە دیارە دەنووسری نامەکەت نەڕۆیشت .



وێنەی (٥)



وێنەی (٦)

سەرچاوە / لە ئەنتەرنێتەوە
HTTP://WWW.ABSBA.ORG/VB/SHOWTHREAD.PHP?S=&THREADID=106173




# ئاسانترین و خێراترین ڕێگا بۆ خێرایی هەڵدانەوەی پەڕەکانی وێب

**بەناز محمد/ سلێمانی**

خێرایی بە ئەنجام گەیاندنی هەرکارێک چێژو زەوقێک دەدات بە بەکار هێنەر لەبەر ئەوەی لەکوردستان چەندان جۆری جیاواز لە پێدانی خزمەت گوزاری تۆڕی ئەنتەرنێت هەنە بەمەش جیاوازن لە خێرایی کارکردن لە هەمانکاتدا جیاوازن لە خێرایی هەڵدانەوەی پەڕەکانی وێب، ئەمە لەلایەک و لەلایەکی تر زۆربەی سیستەمەکانی کۆمپیوتەر ئێستا لە کوردستان ویندۆز ئێکس پین لەم سیستەمەدا هەنگاوێکی زۆر ئاسان هەیە بۆ خێراکردنی هەڵدانەوەی پەڕەکانی وێب لەهەمان کاتدا کاریگەری باشیشی دەبێت لەسەر خێراکردنی ئەم کردارە بۆ جێبەجێکردنیشی بریتیە لە دروست کردنی فایلێکی نوێ لە نوت پاد (NOTEPAD) بەم شێوەیە :

بە نوسینی ئەم چەند دێرەی خوارەوە لە ناو نوت پاد

```
WINDOWS REGISTRY EDITOR VERSION 5.00
HKEY_LOCAL_MACHINE\SYSTEM\CURRENTCONTROLSET\SERVICES\DNSCACHE\PARAMETERS"CACHEHASHTABLEBUCKETSIZE"=DWORD:00000001
CACHEHASHTABLESIZE"=DWORD:00000180"
MAXCACHEENTRYTTLLIMIT"=DWORD:0000FA00"
MAXSOACACHEENTRYTTLLIMIT"=DWORD:0000012"
```

دوایی خەزن کردنی بەناوی (DNSCACHE.REG)، واباشترە لەسەر دیسک توپ دابنرێت، ئینجا نوت پاد دابخە. بۆ زانیاری زیاتر کە لەوێنەی (١) دیارە بەم شێوەیە دەچینە ناو بەرنامەی نوت پاد لە سەرەتادا (START) دوایی لیستی کۆمەڵەی بەرنامەکان (ACCESSORIES) ئینجا کلیک لەسەر نوت پاد دەکەین . لە دوایدا ئەم فایلە نوییە دەکەینەوە بە دەبل کلیک کردن لەسەری یەکسەر بۆکسێک دێت داوات لێدەکات کە ئایا ئەم فایلە نوییە دەخەیتە ناو سیستەمەوە بە ڕەزامەند دەبیت و کردارەکە کۆتایی پیدیت .

# چۆن سود لەگەڕانی google وەردەگریت




بنار ابراهیم

زۆر لەسەر ماڵپەری گۆگڵ نوسراوە کە یەکێکە لە بەهێزترین بزوێنەرەکانی گەڕان لەهەمان کاتدا وردترین گەڕان دەکات بۆ بابەتەکان یان ئەو زانیاریەی کە بەدوایدا دەگەڕێیت، لەڕاستیدا گەیشتن بە زانیاری تەواو و پێویست لەناو ملیۆنەها ماڵپەرو سایتی ئەنتەرنێت کارێکە لێزانینی دەوێت، جگە لەو شێوازەی گەڕانی ئاسایی کەبریتیە لە نوسینی ناو یان ناونیشانێک و گەڕانی بەدوای ئەم زانیاریەدا ئێمە لەم ژمارەی گۆڤاری کۆمپیوتەر بەوردی باسی لایەنە شاراوەکانی سایتی گۆگڵ دەکەین بۆ گەڕان و وردی کارکردن و چۆنیەتی وەرگرتنی زانیاری لەم سایتەدا جا بۆئەوەی کە ئەو زانیاریانە زۆرن ئەو لایەنانە بگرنەوە بڕوانە ئەم تێبینیانە لە سایتی گۆگڵدا:

١- نیشانەی (+) واتە بۆ گەڕانی دوشت بۆنمونە کۆمپیوتەر+ئەنتەرنێت

٢- نیشانەی ( – ) واتە بۆ گەڕانی شتێک بەڵام ئەویتریان نا وەک گەڕان بەدوای کۆمپیوتەر بەڵام ئەنتەرنێت نا (COMPUTER- INTERNET) یان ئەگەر ویستت زانیاری لەسەر ئەنتەرنێت وەرگریت ئەوا لەپێشدا ئەنتەرنێت دەنوسیت ئینجا کۆمپیوتەر .

٣- نیشانەی( " " ) واتە بۆگەڕانی تەواوی ئەو زانیاریەی خراوتە ناو کەوانەکەوە بۆ نمونە " دروست کردنی خواردەمەنی"

٤- نیشانەی (OR ) واتە بۆگەڕانی زانیاری لەشتێک یان ئەویتریان یان هەردوکیان بۆ نمونە گەڕان بەدوای زانیاری کۆمپیوتەر یان ئەنتەرنێت یان هەردوکیان وە بەم شێوە دونوسرێت (COMPUTER OR INTERNET)

٥- نیشانەی INTITLE واتە بۆگەڕانی هەموو ئەو سایتانەی کە ئەم ناونیشانەیان تێدایە کەتۆ داوتە گۆگڵەوە بۆ نمونە (INTITLE : COMPUTER)

٦- نیشانەی ALLINTITLE هەمان مانای پێشوو دەدات بەڵام بەهێزتر وەک ئەوەی داوا دەکەیت زیاتر لەمەش زانیاریت لەسەر ئەم وشەیە بدات کەتۆ بەدوایدا دەگەڕێیت . بەڵام زیاتر لەیەک وشە بۆ نمونە (ALLINTITLE: COMPUTER INTERNET)

٧- نیشانەی INURL واتە بۆگەڕانی ناونیشانی هەموو ئەوسایتانەی ئەم وشەیان تێدایە بۆ نمونە (INURL: KURD).

٨- نیشانەی ALLINURL هەروەکو ئەمەی پێشەوەیە بەڵام بۆ وشەیەک زیاتر بۆ نمونە (ALLINURL : KURD KURDSTAN) .

٩- نیشانەی CACHE واتە بۆڕاکێشانی ماڵپەرێک بەتەواوەتی لەگەڵ ئەو وشەی ئاماژەی بۆ دەکەیت بۆ نمونە (CACHE: WWW.COMPUTER.COM BOOK)

١٠- نیشانەی LINK واتە بۆگەڕانی ئەو سایتانەی کەلینکی سایتی تریان هەلگرتوە بۆ نمونە ئەمانەوێ بزانین ئەوسایتانەی سایتی گۆگڵیان لینک کردوە (:WWW.GOOGLE.COMLINK)

١١- نیشانەی RELATED واتە بۆگەڕانی ئەو سایتانەی کە پەڕی ماڵەوە یان پەڕی سەرەکی سایتەکانی لینک کردوە بۆ نمونە (:WWW.GOOGLE.COMRELATED)

١٢-نیشانەی INFO زانیاریت دەداتی دەربارەی ئەو سایتەی بۆی دەگەڕێیت بۆ نمونە (:WWW.GOOGLE.COM INFO)

١٣- نیشانەی STOCKS بەکاردێت بۆ گەڕان بەهێما بۆ نمونە لەگەڵ هەرهێمایەک ئەم وشەیە دەنوسین (:STOCKS INTEL MAXTOR)

١٤- نیشانەی SITE واتە بۆگەڕان لەناو سایتەکەدا بۆ نمونە ئەگەر بتەوێ داوای یارمەتی لە گوگل بکەیت دەنوسیت (:WWW.GOOGLE.COM HELP SITE)



# هەندێک لە نهێنییەکانی نۆکیای 6600




ئا: ئەمام عمر

لەگەڵ بەپێویست بوونی ئامێرە ئەلیکترۆنیەکان لەناو خەلک بەگشتی مۆبایل وەکو ئامێرێک بەتایبەتی داهێنانیش لەم بوارەدا ڕۆژ بە ڕۆژ لەپەرەسەندن دایە، بەپێی ئارەزوو حەزی تاکە کەس و ئارەزوە گشتیەکانی مرۆڤ کۆمپانیا گەورەکان لە کێبرکێ دان بۆ دروست کردنی چەندان جۆر لە مۆبایل بە چەندەها جواراو جۆرو مۆدیلات تاکو بتوانن خەلکێکی زۆر بۆ خۆیان رابکێشن و بەرهەمەکانیان پێ ساغ بکەنەوە، لەم روانگەشەوە هەموو ئامێرەکانی تایبەت بە مۆبایل خاوەنی کۆمەلێک خەسلەت و تایبەتمەندین کە زانینیان تارادەیەکی باش سودیان دەبێت بۆ بەکارهێنەران ئەوەی مایەی سەرسورمانیشە لەهەموو مۆدیلێکی نوی ئەو ئامێرانە خەسلەتێکی نوی و ئەدایەکی نوییان هەیە بۆ ئەمجارە کۆمەلێک لە نهێنی نوکیای 6600 رونەکەینەوە وئامادەم کردون لەگەلمان بن :

- # 0 #6 ‌ بۆ زانینی سیریالی ئامێرەکەت
- #0000# ‌ بۆ زانینی مێژوی دەرچونی بەرنامەکانی ئامێرەکەت
- #0282# ‌ بۆ زانینی ناونیشانی بلوتوس
- 12345 یان 0000 ژمارە نهێنی سەرەتاییە کە کومپانیای نوکیا داناوە

لەم کودانەی خوارەوە ئاگادار بەو زۆر بەوریایی بەکاریان بێنە

- #7370925538# بۆ سرینەوەی ژمارەی نهێنی مەحفەزەی مۆبایلەکەیە بەلام تەواوی زانیاری ناوی دەسرێتەوەو لەدەست دەچێت .
- #7780# بۆ گەراندنەوەی ئامێرەکەت بۆ سەرەتای کار کردنی (دەبێتە هۆی لەدەست دانی بەشێک لەو زانیارانەی کە خستونتە ناو مۆبایلەکەوە)
- #7780# بۆ فۆرماتی خێرا بەلام دەبێت دلنیا بیت کە پاتری مۆبایلەکەت شەحنی لە 75% کەمتر تیدا نەبێت چونکە ئەم کردارە 4-3 دەقیقە دەخایەنێت .










ئا: هاوکار کۆیی

خۆشەویستان کۆمپانیای INTEL ی ئەمەریکی بەهێزترین و تاکە کۆمپانیایە لەبواری دروستکردنی PROERSSOR. وەتاکەکۆمپانیایە لەنهێنیەکانی دەزانێت بۆیە هەرلەسەرتای دروستکردنی PROCESSOR دووجۆری بۆداناوە یەکەمیان پەنتیۆم و دووەمیان سلیرۆن، بۆیە من ئەوە رۆن دەکەمەوە کەچ جیاوازی هەیە.

### پەنتیۆم

١- کاش میمۆری ١ لەسەر ١ ـە واتەفول کاشە
٢- بەخێراتر کاردەکات
٣- لەگەڵ هەموو بەرنامەیەک کاردەکات
٤- لەکاتی فەرمانێک دا زوو تەواو دبێت
٥- BASS بەرەوو پێشت چوونە
٦- قەبارەی بەجۆری پەنتیۆم دەگۆڕێ

### سلیرۆن

١- کاش میمۆری ١ لەسەر ٤ یان ١لەسەر ٢ واتە چارێگ کاشە یان نیو کاشە
٢- بەپچەوانەی پەنتیۆمە
٣- ناتوانرێت لەگەڵ هەموو بەرنامەیەک کاربکات.
٤ - لەوانەیە زۆر بەداوبکەوێت
٥- BASS نیوەی پەنتیۆمە
٦- بەهەمان شێوە ی پەنتیۆمە

## داهێنانی شاشەیەکی کۆمپیوتەری نادیار

بۆ سەرەتای ساڵی نوێ شاشەیەکی نوێو سەمەرە دەکەوێتە بازارەوە کە بە سەیرترین شاشەی کۆمپیوتەر دادەنرێت، کۆمپانیایەکی یابانی لەدرکاندنی زانیاریە سەرەتایەکاندا باسی ئەوەی کرد کە شاشەیەکی کۆمپیوتەریان دروست کردوە کە هیچ نوسینێک و ئاماژەیەکی لەسەر نیەو واهەست دەکەیت کە لەم شوێنە هیچ دانەنراوەو وە کەس هیچ نابینێت ئەم شاشە نوییە کە بۆ سەرەتای ساڵی ٢٠٠٦ بلاو دەکریتەوە بۆ بینینی بەرنامەکان و کارکردن لەسەر کومپیوتەر بە چاویلکەیەکی تایبەت دەبێت لەهەمان کاتدا ئەم کومپانیایە باسی لەوەکرد کە چەندان پەیوەست نامەیان مۆرکردوە بۆ فرۆشتنی ئەم شاشانەو کە نرخی هەر دانەیەک نزیکەی ٢٠٠٠ — ٢٥٠٠ دولاری ئەمریکیە بەلام ئامادە نەبوو کە پێک هاتەکانی دروست کردنی ئەم شاشە ئاشکرا بکات .

# حکومەتی بەریتانیا ئاگادارییەک بۆ بەکارهێنەرانی مۆبایل بڵاودەکاتەوە




وەرگێڕانی لەعەرەبییەوە:
هەڵۆ سەعید ناکام

حکومەتی بەریتانیا بڕیاریدا بەرنامەیەک بەگوژمەی (٧) ملیۆن جونەهی ئەستەرلینی دابڕێژرێت بۆ بەدوا داچوون لەسەر زیانەکانی بەکارهێنانی مۆبایل لەسەر لەشی مرۆڤ. هەروەها بڕیاریدا ئەو کەسانە ئاگادار بکاتەوە کەزۆر مۆبایل بەکاردەهێنن ڕێگاو شوێنی پێویست و ئامۆژگاری کردن یان بکات سەبارەت بەزیانەکانی مۆبایل. ئەم بڕیارانە هاوکات دێت لەسەر ئەو ڕاپۆرتانەی کەلیژنەی (ستیوارت) دایناوە هەروەها لیکۆلینەوە لەسەر هەندی سکالا دێت کەدەلی مۆبایلی هەلگرتوو زیان بەلەشی مروڤ دەگەیەنیت هەروەها لیژنەی ناوبراو هەلدەستی بەبلاوکردنەوەی (بلاوکراوە) لەسەر مۆبایل فرۆشەکان لیکۆلینەوەکان ئاماژەیان بۆ ئەوە کرد کەتا ئیستا هیچ بەلگەیەکی ڕون و ئاشکرا نیە کە مۆبایل بۆلەشی مرۆڤ زیانی هەبیت بەلام لە هەندی کاتدا دەبی ڕێ و شوێنی پێویست بگریتە بەر لەوانەشە بەپێچەوانەی دیدو بۆچونەکان بۆ حکومەتی بەریتانیا بگەڕیتەوە ڕاپۆرتەکە ئاماژە بەوە دەکات کە هەندی لەشارەزایان بەشێوەیەکی تایبەت بەکارهێنانی مۆبایلیان لەمنداڵەکانیان قەدەغە کردوە تەنها بۆکاری زۆر پێویست نەبێت ئەوەش چونکە کاریگەری خراپ لەپاشە ڕۆژ پەیدا دەبێت کە پەیوەندی بەگەشە کردن و مێشکی منداڵەوە هەیە هەروەها کەلەی سەری ناسکی منداڵەکان توانایی بەرگری نیە لەدژی تیشکی لاسلکی کەلەمۆبایلەوە دێت ئەوە ئەگەر سەلمێندرا کە مەترسی هەیە ئەوژمارانە دەریان خستوە کەتەنها لەبەریتانیا (٢٥) ملیۆن کەس مۆبایل بەکار دەهێنن هەروەها لە ٢٥٪ ئەوکەسانەن کە تەمەنیان لە (١٨) ساڵ کەمترە .هەروەها لیکولەرەوەکان دەریان خستوە کەزۆرترین کەشۆفێرەکان ئۆتۆمبێل کەتوشی پێک دادان دەبن لەو کاتانە دێت کەمۆبایل بەکار دەهێنن لەگەڵ ئەوەشدا زانایان پێیان وایە کەمۆبایل زیانی هەیە هەندێکیان دەڵێن بەکارهێنانی مۆبایل دەبێتە هۆی سەرئێشان و شت لەبیر چوونەوەو کەم نوستن هەندێکیشیان پێیان وایە کەزۆر بەکارهێنانی مۆبایل دەبێتە هۆی دروست بوونی (وەرەمی مێشک) لەهەندیک کاتدا بەلام تا ئێستا بەدیلیک بۆمۆبایل نەدۆزراوەتەوە کەتیشکی نەبێت و بەدەست هەڵنەگیری چونکە بەدەست تیشکەکان دوور دەخاتەوە لە گوێ و سەر هەندی لەزانایانی ئوستراليا دەڵێن کەبەکار هێنانی وایەر لەمۆبایلەوە بۆ گوێی مرۆڤ زیانی زیاترە چونکە ڕێژەی تیشکەکانی زیاد دەکات کەمێشک وەری دەگرێت.

# کۆمپانیای نۆکیا و ئنتێل هەڵدەستن بەدروستکردنی پەرەی WiMax

**ئا: ڕێبوار عبدالقادر**

بەم دواییە کومپانیای نوکیا کە بریکارە لەدروستکردنی موبایل و بابەتە ئەلیکترونیەکان لەگەل کومپانیای ئنتیل هەلسان بەدروستکردنی ئەو پەرەی کەلەناو هاردا هەیە بەشیوەیەکی نوی و پیشکەوتولەشیوەی WIMAX شایانی باسە ئنتیل هەربەدوای پیشکەوتنی زیاترە لەدونیای کومپیوتەردا وەک لەپیشوو کە خیرایی (سەنترینو)ی پیشکەوتوی بەکارهینا بو کومپیوتەرە جانتاییەکان بەمەش هەلسا بەیەکگرتن لەگەل کومپانیای نوکیا بو ئەوەی زیاتر پیشکەوتن بەئامیرە کومپیوتەریەکان بدات.

# ئامێری UPS بۆ پاراستنی ئامێری کۆمپیتەر لە پچڕانی کارەبا


ئا: کاروان شێرزاد


خۆشەویستان ئامێری کۆمپیتەر ئامێرێکی هەستیارە بۆیە نابێ لەکاتی کارکردنیدا کارەبای لێ بپچڕێ، دەبینین کەکارەباکەمان زۆر تەواونیە زۆر جارلەکاتی کارکردنیدا بەهۆی پچڕانی کارەبا کۆمپیتەرەکەمان دەکوژێتەوە ئەمەش زۆر خراپە بۆ پارچەکانی کۆمپیتەرەکەمان و دەبێتە هۆی تێکچونی ویندۆزەکە و زۆر جارهەیە بەشی هەلگر واتە هارد ەکە ڕادەوستێت. جا لێرەدا ئامێری بارگاویکەر (شحن) ئەم کێشەیەمان بۆ چارەسەردەکات مەبەستمان UPS ـە ئەم ئامێرە ناهێلێت لەکاتی پچڕانی کارەباکە کۆمپیتەرەکەمان بکوژێتەوە بۆماوەی چەند خولەکێک تاوەکو ئەوکارەی کەکردومانە کۆگەبکەین و دواتر کۆمپیتەرەکە بکوژێنینەوە. بۆیە بوونی ئەم ئامێرە زۆر پێویستە بۆ پاراستنی کۆمپیتەرەکەمان و سیستەمەکەی.




# ئنتێل و دروست کردنی دوو پرۆسێسەر Intel r Itanium r 2

ئا: ئەڤین ضیاءالدین

بۆ گواستنەوەی خێرا وەک دەزانین کۆمپانیای ئنتێل تاکە کۆمپانیایە لەدروستکردنی پرۆسیسەروە لەم بوارەشدا زۆرسەرکەوتوە بەلام ئنتێل هەربەمە ڕاناوەستێت بەم دواییە هەستا بەدروستکردنی دوو پرۆسێسەر کە خێرایی یەکی زۆریان لەخۆگرتوە بۆگواستنەوەی زانیاری لەپرۆسێسەرەوە بۆناو پەرەی هارد، یەکەم جار پرۆسیسەری ایتانیوم ٢ ی دروستکرد کە خێرایی گواستنەوەی ٦٦٧ میگاهێرتز بوو بەلام بەمەش نەوەستا ئەوجارەیان هەستا بەدروستکردنی پرۆسیسەریکی تر کەناوی (مۆنیسیتۆ)ی لەخۆگرتوە ئەمەیان لە ٪٦٥ هێزی روی گواستنەوەی زیاتر وا بەخێرایی ٤٠٠ میگاهیرتز زانیاری دەگوازێتەوە بۆسەر پەرەی هاردەکان بەهێنانەخوارەوەی پێوانەی پرۆسیسەر ئنتێل توانی ئەم شتە نایابە بێنێتە ئاراوە (وێنە ١) بۆزانیاری زیاتر سەیری WWW.FUTURESEYE. NET.



# ئامێری تەرازوی ئەلکترۆنی Bodymaster

ئا: دلێر جەوهەر

یەکێک لەکومپانیاکانی جیهانی بەناوی PERSONAL SCALES هەلسا بەدروستکردنی ئامێریکی تەرازوو کەدەتوانیت کێش وسەنگ و قەبارەی پی بپیویت، بەشیوەیەکی هەستیارو شاشەیەکی هەیە کەهێماکانی دیاردەکات، شایەنی باسە ئەم ئامیرە لەگەل کومپیوتەر دا کار دەکات وبەپورتی USB لەگەل کومپیوتەر دەبەستریت و هاردی تیدایە کە قەبارەکەی دەگاتە ٥ پینج میگابایت و هەروەها زاکیرەی واتە رامی ٤ چوار میگایە بویە دەتوانریت ئەو کیشەی یاخود ئەو دیاری کردنانە بەشیوەی تیکستی داتا کوگە بکات و دواتر بیگوازیتەوە بو ناو کومپیوتەر.

**پوزەش**

لە ژمارە ( ٧ ) گوڤاری کومپیوتەردا بابەتیک بە ناونیشانی (دروست کردنی حاسبە لە ڤیژوەل بیسک) شایانی باسە ئەم بابەتە لە ئامادەکردنی بەریز (ئارام شەپریو) ە و لەبەر ئەوەی بە هوی ئیمیلەوە بابەتەکەی بومان ناردبوو و ناوەکەی لەسەر پیشەکیەکە دانابوو ئەم کیشەیە درووست بوو، بویە تکامان وایە ئەو برادەرانەی کە ئیمیلمان بو دەنیرن ئەوا رەچاوی ناوەکانیان بکەن واتا لەسەر لاپەرەی نووسینەکانی بابەتەکە ناوەکانیان بنووسن.



# نۆکیا بابەتێکی ڕەنگی زیوی لە یاری N Gage QD دەردەکات لەئەوروپا و باکوری ناوەڕاست




**ئا: دیدار شیرزاد**

نوکیا بـەم دوایە رایگەیانـد کە نوکیا بابەتیکـــی رەنگـی زیـــوی لە یاری N GAGE QDدەردەکات شـایانی باسـە تاکو ئیستا بەردەوامە لە پیشکەوتنەکانی گورەپانی یـاری کەتاکە بریکارە لەیاریە بەهیزەکانـی ڤیدیویـی و ئەلیکترونـی بەوینەی یـاری ONE وSYSTEM RUSH وIKUSA PATHWAY TO GLORY وISLANDS HIGH SEIZE. هەروەها (یوکا هوسـیو) کە بەریوبەری گشتی ناوەندی یاریە لە شەریکەی نۆکیا ووتی: داواکاری زور لەبەکارهینـەرەکان و بریـکارەکان بۆمان دیت کەشـتی زیاترو پیشکەوتوو تریان بدەینی بۆیە لەوە زیاتر پیشکەوتن بەیاریـە ڤیدیۆیـی و ئەلیکترونیـەکان دەدەین.



# (ئنتێل و Setting ی 64bit)


ئا: كاروان سلێمان


ئەم كارە بە یەكێک لەپێشكەوتوترین تەكنۆلۆژیای كۆمپیوتەر دادەنرێت لەبەرئەوەی تا ئێستاش تایبەتمەندی ڕوی شاشەو نیشاندانی روی شاشە بریتیە لە ٣٢ بت بەلام بەدوزینەوەی ئامانجی پێشكەوتن روی شاشە بو ٦٤ بت گورا بەمەش كومانیای ئنتیل دەڵێت نیشاندانێكی زوربەهێز و زوربەرێک و پێكی بێ ئەوەی گرفت دروست ببێت لەكاتی نیشاندانی ڤیدیۆ و وێنە روبەری شاشەمان زیاد كرد بۆ ٦٤ بت بەمەش پێشكەوتنێكی بەرچاو رویدا لەبواری كومپیوتەر، سیستەمی ئەوكارەش كەناوی INTELR EXTENDED MEMORY (64 TECHNOLOGY (INTEL EM64T لەخۆی گرتوە ئەمەش بەبەكار هێنانی كارتی شاشەی جۆری INTEL EM64T ـە كە نرخێكی گونجاوی بۆ دانراوە وەک كومپانیای ئنتیل دەڵێت هەموو كەس دەتوانێت لەسەر كومپیوتەرەكانیان ئەم كارتە بەكار بێنن.